# رۆشنبیری نوێ

ژماره ۷۹ ئادار ۱۹۸۰



با بەردەوام بێ جەژنەکانی ئادارو نەورۆزی پیرۆز



# لەم ژمارەیەدا


| | |
|---|---|
| ● ڕۆشنبیری کوردی بەرەوپێشەوەچوونێکی پەرەسەندو لە سایەی شورش‌دا | |
| ● ئاوەڵنێو لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو خواروودا | نووسینی : د. قەناتی کوردو<br>وەرگێرانی : د. کوردستان موکریانی |
| ● چەند لایێت ڤەشارتی د ستران کوردی‌دا | سگڤان عبد الحکیم |
| ● علی کمال باپیر ئاغا چەند سرنجێک‌و پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوەی | د. عز الدین مصطفی رسول |
| ● ڕۆژ | محمد رشید فتاح وەری‌گێراوە |
| ● هەندێک بەرهەمی کتێبخانەی کوردی | مکرم رشید تالەبانی |
| ● بوهارا کوردستانێ | محفوظ مائی |
| ● کە ئافرەت لە خۆی ئەبوری چارەکردنی | نجاة رفیق حلمی |
| ● زۆربوونی پەستانی چاو ... هۆیەکانی و چارەکردنی ل ٢٨ | و : ئازاد مصطفی محمود |
| ● ڤینیست ڤان‌کۆخ | محمد عبد الجبار سالەیی |
| ● چەند پەراویزیکی فەرهەنگی لەک‌ولوڕ | محمد علی قەرەداغی |
| ● چەند تیوریك دەربارەی ( بی ئارامی ) | |
| ● شیزوفرینیا چی‌یەو چون چارەسەر دەکری | کریم سۆفی |
| ● ئەدەب بو بچیکا | ناصح کاك عثمان |
| ● ئەو مروڤەی ژیانی سەربەستی لە هەموشتی‌لا بەرزتربووە | د. بدرخان سندی |
| ● مەی‌و مەیخانە لە شیعری هیمن‌دا | عزیز رشید حەریری ئامادەی کردووە |
| ● گرنگی‌و دەوری فێرکردنی گەوران لە پەرەسەندن‌دا | محمد امین احمد |
| ● بانگەوازیك | د. محمد منیر مرسی |



ڕۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە

دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الفلاني بغداد

تەلەفۆن: ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرنووسەر

اسماعیل رسول

جێگری سەرنووسەر

فائق جمیل



# بەرنامەی کاری

## ڕێکخستنی پەیوەندیە نەتەوەییەکانی نێوولاتانی عەرەب

● یەکەم : ڕەفز کردنی هەبوونی سوپاو هێزی سەربازیی و هەموو هێزو بنکەیەکی بێگانە لەنیشتمانی عەرەب یان ئاسان کردنی هەبوونی بەهەر ڕێوشوێنێك و لە ژێر هەر پەردەیەکدا بێ و لەبەر هەرهۆیەك بێ و دابڕینی هەر ڕژێمێکی عەرەبی کە پابەندی ئەم بیروباوەڕە نەبێ و لەباری سیاسیی و ئابووری‌یەوە پەیوەندی لەگەڵدا بپچڕێنرێ و بە هەموو ئەو ڕێگایانەی لە ئارادان بەربەرەکانی سیاسەتەکەی بکرێ .

● دووەم : ڕێگا نەدان بۆ بەکارهێنانی هێزی چەکدار لەلایەن هیچ دەوڵەتێکی عەرەبی‌یەوە دژی دەوڵەتێکی عەرەب و چارەسەر کردنی ئەو ناکۆکی‌یانەی لەوانەیە لەنێو دەوڵەتانی عەرەبدا ڕوو بدەن بەرێگای ئاشتی‌یانە ولەسایەی بیروبلوەڕەکانی کاری ناوکۆیی نەتەوەیی و سودو قازانجی بەرزی عەرەب .

● سێیەم : ئەو بنەرەتەی لە بەندی دووەمدا هات

بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان نەتەوەی عەرەبو وڵاتەکانیدا لەگەڵ نەتەوەو وڵاتە دراوسێکانی نیشتیمانی عەرەبدا دەچەسپێنرێو نابێ پەنا ببرێتە بەر بەکارهێنانی هێزی چەکدار لەو نیزاعانەدا کە لەگەڵ ئەم وڵاتانەدا هەڵدەگیرسێ تەنیا لە حاڵەتی داکۆکی کردن لە سەربەخۆییو داکۆکی کردن لەخۆ نەبێ دژی ئەو هەڕەشانەی لە ئاسایشی وڵاتانی عەرەبو سودوقازانجە جەوهەرییەکانیان دەکرێن .

● چوارەم : ـ هاوکاری کردنی گشت وڵاتانی عەرەب دژی هەر دەستدرێژییو ڕێز شکاندنێك کە لایەنێکی بێگانە بەرامبەر بە سەربەخۆیی هەرێمایەتی هەروڵاتێکی عەرەب بیکات یاخود جەنگی لەگەڵدا بکاتو ئەم وڵاتانە هاوبەشییانە بەرەنگاری ئەو دەست درێژییانە ببنو بەهەموو ڕێگایەك زیندە بەچاڵی بکەن ولەمانە کاری سوپاییو بەکۆمەڵ پەیوەندی سیاسیو ئابوری پەیوەندییەکانی تر کە سودوقازانجی نەتەوەیی دەیسەپێنن لەگەڵیدا ببچڕێنن .

● پێنجەم : ـ دووپات کردنەوەی پابەندبوونی وڵاتانی عەرەب بە قانونو نەریتە نێو دەوڵەتییەکان سەبارەت بە بەکارهێنانی ئاوو ئاسمانو هەرێمەکان لەلایەن هەر دەوڵەتێکەوە کە لەگەڵ هیچ دەوڵەتێکی عەرەبیدا لەحاڵەتی جەنگدا نەبێ .

● شەشەم : دوورکەوتنەوەی وڵاتانی عەرەب لە زۆرانبازیو شەڕە نێو دەوڵەتی یەکانو پابەندی بێلایەنیو بەهیچ لایەکدا نەشکاندن بن بەرامبەر بەهەرلایەنێك لە لایەنەکانی زوورانبازیو شەڕەکە ئەگەر هیچ لایەنێکی شەڕەکە ڕیزی سەربەخۆیی هەرێماتی عەرەب نەشکێنێو مافە نەگۆڕاوەکانی وڵاتانی عەرەب پێشێل نەکەت ئەو مافانەی کە یاساو نەریتە نێو دەوڵەتییەکان دانیان پێدا ناونو وڵاتە عەرەبییەکان هێزە سوپاییەکان ـ بە هیچ جۆروشێوەیەك ـ لە شەڕو نیزاعە سوپاییەکانی ناوچەکەو دەرەوەیدا بەکار نەهێنن جا لەجیاتی هەر دەوڵەتێك یاخود لایەنێکی بێگانەبێت .

● حەوتەم : پابەندبوونی وڵاتانی عەرەب بە دامەزراندنی چەندین پەیوەندی پەرەسەندوو بنیات نەرانەی ئابوری لەنێوان خۆیاندا بە جۆرێك کە بێتە مایەی دابین کردنی زەمینەیەکی هاوبەش بۆ بنیاتنانی ئابوری پەرەسەندوی عەرەبو یەکگرتنی عەرەبو وڵاتانی دوور بخاتەوە لە ڕەفتارێك کە لەوانەیەزیان بەم پەیوەندییانە بگەیەنێ یاخود پەکی بەردەوام بوونیان بخات بەبێ گوێدانە جیاوازیی ڕێژیمە عەرەبییەکان ئەو ناکۆکییە بچوکە سیاسییانەی کە لەنێوانیاندا ڕوو دەدەن مادامەکی لایەنەکانی پەیوەندییەکە پابەندی بیروڕاکانی ئەم ئاگادارییەن

وڵاتانی عەرەب پابەندی بەرامبەریی ئابوری نەتەوەیی دەبنو ئەو وڵاتە عەرەبییانەی لەباری ئابورییەوە بەتوانان بەڵین دەدەن کە هەموو جۆرە یارمەتییەکی ئابوری پێشکەش بە وڵاتە عەرەبیەکان بکەن بەوشێوەیەی کە لە ڕێ تێچوونی پشتبەستن بە هێزە بێگانەکان دەبێتە مایەی زیاندان لە سەربەخۆییو ویستی نەتەوەیی بیانپارێزێ .

● هەشتەم : عیراق کە بنەرەتەکانی ئەم ڕاگەیاندنە دادەنێ دووپاتی دەکاتەوە کە ئامادەیە کە بەرامبەر بەهەموو وڵاتێکی عەربو ئەو لایەی پابەندێتی پەیڕەوی بکاتو پابەندیبێو ئامادەیە کە لەگەڵ برابانی عەرەب موناقەشەی بکاتو عەرەب موناقەشەی بکاتو گوێ لە بیروڕاکانیان بگرێ بەجۆرێك کە ببێتە مایەی پتر کاریکەر کردنی بنەرەتەکانیو قولکردنەوەی ناوەرۆکەی .

هەروەها عیراق دووپاتی دەکاتەوە کە ئەم ڕاگەیاندنە لەبریو جێگرەوەی بەرنامەی کاریدەزگای وڵاتانی عەرەبو پەیمانی هاوبەشی بەگریو هاوکاری ئابوری نێوان دەوڵەتانەی دەزگاکە نییە بەلکو پتەوکەوی بەرنامەی کارو پەیمانەکەیەو پەرەیان پێدەدات بە جۆرێك کە لەگەڵ زروفە نوێیە نێو دەوڵەتییەکانو ئەو مەترسییانەدا کە هەرەشە لە نەتەوەی عەرەب دەکەنو لەگەڵ ئوبالی نەتەوەیی کە لەزروفی ئیستاداو لەپاشە ڕۆژدا دێنە کایەوە تەبابێ.

**صدام حسين**

**سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش**

**سەر کۆماری عیراق**

**٨ ی شوبات ١٩٨٠**



# رۆشنبیری کوردی لەگۆڕانێکی بەرەوپێشەوە چوون لەسایەی شۆڕشدا

● پاش ئەوەی لە لایەن سەرکردایەتی‌ی حزب و شۆڕشەوە لە ٩ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٦٩دا ، مافە رۆشنبیری‌یەکانی گەلی کوردمان لە عیراقی خۆشەویستماندا ، رۆشنبیری‌ی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی‌ی کوردی پاش چەندین سەدەی دوورو درێژی تاریکی‌و دواکەوتن‌و ددانپێدانەنان لە لایەن کاربەدەستەکانی سەردەمە ڕزیوەکانەوە ، پێ‌ی‌نایە قۆناغێکی مێژوویی پرشنگدارەوە ، بەمەیش دیسانەوە ، سەرکردایەتی‌ی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست مرۆڤایەتی‌ی شۆڕشی ( ١٧ — ٣٠ ) ی تەمووزی نەتەوایەتی‌ی سوشیالیستی دووپات کردەوە ، هەروەها بە خشتەکانی ڕاستکۆیی شۆڕشگێری لایەنگرتنی ئەوپەیمانەیان دووپات کردەوە کە سەرکردایەتی بۆ بنیاتنانی عیراقی گەشەسەندووی دوارۆژ خستبویە ئەستۆی خۆیەوە،ئەویش لە چوارچێوەی ئامادەکردنی هەموو توانا نەتەوەیی‌و نیشتمانیەکانەوە بۆ ئەم ئامانجەو ، بەشداری کردنی عەرەب‌و کوردو کەمایەتی‌یە نەتەوەیی‌یە براکانی تر لەم ڕێڕەوە شۆڕشگێری‌یەدا .

دوای شۆڕشی ١٧ — ٣٠ ی تەمووزی ١٩٦٨ بە سەرکردایەتی‌ی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ، توانا داهێنەرەکانی رۆشنبیری‌ی کوردی تەقینەوەو ، دەستەیەکی پێشکەوتووی ئەدیب‌و رۆشنبیرو نووسەرو هونەرمەندە نەتەوەیی‌و نیشتمانپەروەرەکانی کورد بوون بە پێشڕەوی ڕێڕەوی رۆشنبیری‌ی کوردی ، بە بڕواوە بە عیراقی نوێ‌ی شۆڕشگێڕو ، بە باوەڕەوە بەبنەرەت‌و ئاواتەکانی شۆڕشەوە ، ئەوەبوو بلێسەی رووناکی کە ڕێگاو ڕێبازەکانی ڕێڕەوەکەی رووناك دەکردەوە ، بە هێزی شۆڕش‌و ئەو توانایەی نیشان‌دەدا کە بۆ بەرەنگاری‌ی مەترسی ترین کۆسپ‌و ... مەیدان خوازیی شۆڕشگێرانەی هەموو دژواری‌یەکان سنووری بۆنی‌یە .

ئەگەرچی بەر لە ددانپێدانانی مافە رۆشنبیری‌یەکانی گەلی کوردمان لە عیراقدا ، زانکۆی سلێمانی لە ٢٣ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨ دا ، وەك یەکەمین دەزگای پەروەردەیی لەم رادەیەدا لە ناوچەی کوردی‌دا دامەزرا ، ئەوا ئەو دەستکەوتە رۆشنبیری‌یانەی دوا بەدوای ئەو بەدی هاتن ،

تەووژمێکی بەرەوپێشەوە چووپاز بە ژیانی نوێی گەلی کوردمان لە هەموو لایەنێکی رۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رامیاری یەوە بەخشی ، ئەوا ئەو ووزە شۆرشگێری یەی لە رەوتی رۆشنبیری ی کوردی دا بوو کە شۆرشی ( ١٧ — ٣٠ ) ی تەموز تەقاندی یەوە بە بەخششەکانی هەموو لایەنەکانی ئەم ژیانەیان گرتەوە .

ئەوەبوو لە مانگی ئابی ١٩٧٠ دا کۆری زانیاری ی کورد دامەزراو ، لە چوارچێوەی گۆڤارە مەزنەکەیەوە کە بە سەرچاوەیەکی گەورەی کەلەپوورو بووژانەوەیەکی بێهاوتای کلاسیکی ی ئەدەبی کوردی و ، هەروەها لە چوارچێوەی یارمەتی دانی ئەو چاپەمەنی یانەی بە زمانی کوردی دەرچوون و ، یارمەتیدان و پشتگیری کردنی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر لێکۆڵینەوەو بووژاندنەوەی ئەم کلاسیکی یە بێهاوتایانەو ، رزگارکردنیان لە سووران و بیرچوونەوە ، دەستی بە چالاکییەکانی خۆی کرد ، ئێستایش دەستەی کوردی لە کۆری زانیاری ی عیراق لایەنێکی گرنگ و بە بایەخی لایەنەکانی رۆشنبیری و ئەدەبیاتی کوردی دەچەسپێنێت و پەرەپێدەدات .

پێش ئەوەیش یەکێتی ی نووسەرانی کورد لە شوباتی سالی ١٩٧٠ داو ، کۆمەڵەی رۆشنبیری ی کوردی لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا دامەزران ، ئەوەبوو ئەو دوو دەزگایە رۆشنبیری یە دەورێکی کاریگەریان بینی لە دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیری ی کوردی دا ، بە باشترین و چالاکترین بەخششی رۆشنبیری و ، لە باوەش گرتنی توانا داهێنەرە گەنجەکان و پێکهێنانی میهرەجان و کۆرە ئەدەبی و هونەری یەکان و ، ناساندنی پیاوە رۆشنبیرەکانی کوردو چەسپاندنی برایەتی ی کوردو عەرەب ، ئەویش لە چوارچێوەی ئەدەبی بەراووردکاری و ، هۆنراوەو هەڵویست و ئەو ووتانەی کە لە راپەرینە نیشتمانی یە هاوبەشەکان و ، ئەو شۆرشانەی گەلی عیراقمان بەرپای کردن ووتراون و بەکار هێنراون ، هەر لە شۆرشی بیستەوە ، هەموو شۆرش و راپەرینە نەتەوەیی و نیشتمانی یە هاوبەشەکانی تردا ، کە بە خوێنی شەهیدانی جەماوەری عەرەب و کورد پیرۆز کراون .

لە لایەنی رۆژنامە نووسی ی کوردی یشەوە ، هەر لە زووەوە رۆژنامەی هاوکاری هاتە مەیدان و بەرێوەبەرێتی ی رۆشنبیری ی کورد هاوکاری دەزگای بۆ بلاوکردنەوەو چاپەمەنی کوردی دامەزران کە لە پاشان لێك دران و لە ٤ی نیسانی ١٩٧٦ دا بوون بە دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، ئەم دەزگا رۆشنبیری یەی کە تەواوو بەردەوامی لە لایەن دەولەتەوە پشتیوانی لێدەکرێت ، چەند کۆمەڵە چاپەمەنییەکی رۆژنامەنووسی بلاودەکاتەوە ، لەوانە رۆژنامەی «هاوکاری»ی هەفتانەو گۆڤاری «بەیان»و « رۆشنبیری نوێ » . ، ئەم دەزگایە کۆمەڵێك رۆژنامەنووس و ئەدیب و نووسەرو رۆشنبیری چالاکی کورد تیایدا ئیش دەکەن ، سەرەرای ئەوەی چاپەمەنیەکانی بە نوێترین شێوەی چاپەمەنی دەردەچن .



گۆڤاری «ئۆتۆنۆمی» یش کە ئەنجوومەنی یاسادانی ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی دەری دەکات ، سەرەڕای ئەو باسە رۆشنبیریو ئەدەبیانەی تێدایەتی ، ئەوا مەحزەرەکانی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنو لێدوانو لێکۆڵینەوەکانیو ئەو دەستکەوتانەی لە ناوچەی کوردیدا بەدی دێنو ئەوانەیش کە پاش دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان لە ١١ ی ئازاری ساڵی ١٩٧٤ دا بەدی هاتوون ، پێشکەشی خوێنەرەکانی دەکات ، ئەمانەیش دەستکەوتی مەزنو نموونەیەکی پێشکەوتووی جێبەجێکردنی شێوەی ئۆتۆنۆمین .

هونەری کوردی ، ئەویش ئەمڕۆ ، رۆشنایەکی درەوشاوەی رەوتی ژیانی پەرەسەندووی گەلی کوردە لە عیراقی شۆڕشدا ، ئەوەتا تیپی مۆسیقای سلێمانیو تیپەکانی مۆسیقاو شانۆگەریی دیکە لە هەموو وەرزێکدا سەرکەوتنی بەرز لە بواری ناوچەکەو هەرێمدا لە یەك ڕادەدا بەدی دەهێنن . ، ئەوەبوو بزووتنەوەی شانۆی کوردیو ئەو نواندنە تەلەفزیۆنییانەی تەلەفزیۆنی تەئمیم پێشکەشیان دەکات گۆڕیان تێکەوت ، هەروەها بەرهەمەکانی هونەری تەشکیلی لە نیگار کێشانو پەیکەرتاشیو وێنەگرتنو شتیتر دەرەوشانەوەو،یەکەمین مەهرەجانی هونەری کوردیش کە لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە بەغدا بەستراو بەڕێوەبرا ، بە زەماوەنێکی هونەریی نایاب دژمێردرێت کە هەرگیز لە بیر نەچێتەوە ، ئەوەبوو توانا داهێنەرەکان لەو مەهرەجانەدا بە شێوەیەکی بێهاوتای وا کە لەوەوپێش وێنەی نەبووبێت پێیان هەڵهێناو ، تێیدا تێڕوانینی شارستانیانەی هونەری کوردی دووپات کرایەوە .

سەرکردایەتیی حزبو شۆڕش لایەنی رۆژنامەنووسیو راگەیاندن لە ڕێڕەوو ڕەوتی رۆشنبیریو وێژەو هونەری کوردیدا پشتگوێ نەخست ، ئەوەبوو چەندین گۆڤارو رۆژنامەو چاپەمەنی راگەیاندن بە زمانی کوردیو ، بەهەردوو زمانی عەرەبیو کوردی دەرچوون ، ئێستایش ، سەرەڕای ئەو گۆڤارو رۆژنامانەی لە پێشەوە ناویان براوە گۆڤاری « پەروەردەو زانست » هەیە کە بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی دەری دەکاتو ،



گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » کە زانکۆی سلێمانی دەری دەکاتو ، گۆڤاری « کولێجی ئەدەبیات ـ بەشی کوردی » و ، گۆڤاری « رۆژی کوردستان » کە کۆمەڵەی رۆشنبیریی کوردی « دەری دەکاتو ، گۆڤاری شۆڕشی کشتو کاڵی » و ، گۆڤاری « نووسەری کورد » کە یەکێتیی نووسەرانی کورد دەری دەکاتو ، « پاشکۆی عیراق » کە پاشکۆیەکی مانگانەیە رۆژنامەی « عیراق » بە کوردی دەری دەکاتو ، گۆڤاری « دوارۆژ » کە لە لایەن ئەنجوومەنی باڵای نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە دەردەچێت و ، هەروەها « گۆڤاری دەنگی کرێکار »و گۆڤارو بڵاوکراوەی تر کە ناو بە ناو دەردەچن .

ئاسۆی رۆشنبیریی کوردی ، ڕۆژ بە ڕۆژ ، درەوشانەوەیەکی رووناکو بەردەوام بە خۆیەوە دەبینێتو ، بەخشینە بە پیتەکانی لە عیراقی خۆشەویستماندا دووپات دەبێتەوە ، بەمەیش ئەنجامی بێهاوتای برایەتیی نەتەوەکانو ، چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتیی کورد پیشکەش دەکات بەو شێوازەی کە شۆڕش خستیە شوێنی تەواوکردن و راپەندنەوەو ، لە پێناوی دوارۆژێکی روناك تری نیشتمانە خۆشەویستەکەماندا .. عیراقی شۆڕشو نەمری ●

روشنبیری نوێ

## ئاوەڵنێو

# لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خوارووداا

نووسینی : دکتور قەناتی کوردۆ
وەرگێرانی : د. کوردستانی موکریانی

ئەو بەشەی ڕێزمانی کوردی‌یە ، کە بە شێوەیەکی نافراوان لێی کۆڵدراوەتەوە وە کەم باسکراوە لەوانەی باسیان کردووە « ف . جوستی » ....(١) لە بەرهەمە ڕێزمانی‌یەکەی خۆیدا لەگەڵ نێو باسی ئاوەڵنێو دەکا وە نێزیکەی لاپەرەیەکی بۆ تەرخان کردووە . «ر. ف. جاردن » ....(٢) یش هەر لە یەک لاپەرەدا ژمارەیەکی لە ئاوەڵنێوی چۆنی هێناوەتـــەوە شێوەی پلـــەی بەراوردیشی داوە . « د.ن. مەکەنزی » .... (٣) وە « ی.ن. مەکارۆس » .... (٤) باسی ژمارەیەک لە ئاوەڵنێوی چۆنی دەکەن وە پلەی بەراوردو باڵاشیان بۆ دارشتووە . « ل . فاسوم » .... (٥) هەر بەم شـــێوەی ئەوانـــەی ژووروو باســـــی ئاوەڵنێوی کردووە .

کێشـەی جۆرەکانـــی ئاوەڵنێو وە هۆیەکانـــی دارشتنی لە بەرهەمەکانی لە سەروو نێوبراودا نرخێکی ئەوتۆی نەدراوەتێ و بەتەواوی لێی نەکۆڵدراوەتەوە .

لەم کارەی خۆماندا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی فراوانتر و قووڵتر لەم بەشەی ئاخافتن بکۆڵینەوە .

ئاوەڵنێو لە ڕووی شێوەوە هیچ جیاوازی‌یەکی لەگەڵ نێو دا نی‌یە هۆی بنەرەتی لێک جیابوونەوەیـان تەنێ واتایە .

**ئاوەڵنێو** لە ڕووی شێوەوە نە رەسەنەوە نە ژمارە دەرنابڕێ و پێشان نادات . نیشانەکانی کە لێگۆڕی « رەسەن و ژمارە » لەو کاتەدا بە دیار دەکەوێ کاتێ **ئاوەڵنێوەکە لە** لەگەڵ **نێوێکدا** دێت . ڕۆڵـــــــی سینتاکسی **ئاوەڵنێو** بە شێوەیەکی گشتی « دیارخەری و گوزارەی » یە .

**ئاوەڵنێو دابەش دەکرێتە سەر دوو بەش :**

**١ ـ ئاوەڵنێوی چۆنی**

**ئاوەڵنێوی نسبی**

**ئاوەڵنێوی چۆنی**

**ئاوەڵنێوی چۆنی** دابەش دەکرێتە سەر چەنـــد گروپێک :

١ ـ **ئاوەڵنێوی چۆنی** ، کە بۆ هەردوو دیالێکتە کە گشتی‌یە ، لەمانە .

آ ) **ئاوەڵنێوی** لە ڕووی فۆنیمەوە ڕێک کەوتوو : ڕەش ، سپی ، ئاڵ ، باش ، گەرم ، کورت ، کەسک ، ســـت ، بچووک ، درێژ ، بۆز ، چاک ، سنوور ، پاک ،

پیس ، تەنگ ، بلند ، شین ، پان ، دوور ، راست .

ب ) **ئاوەڵنێوی** لە رووی فۆنیمەوە جیاوازەە ، بەلام رەگیان یەکە :

| کرمانجی ( کرمانجی ژووروو ) | سۆرانی ( کرمانجی خواروو ) |
| --- | --- |
| هشك | ووشك |
| هوور | وورد |
| كور .... (٦) | كوێر |
| زەر | زەرد |
| نوو | نوێ |
| ژار | هەژار |
| نێزیك .... (٧) | نزیك |
| ڤالا .... (٨) | ئاوەلا |
| زرنگ | زرینگ |
| كوور | قووڵ |
| سڤك | سووك |
| شیرن .... ٩ | شیرین |
| هێنك | فێنك |
| ئەرزان | هەرزان |
| خوەش | خۆش |
| گەنی | گەندە |
| سار | سارد |
| تووژ | تیژ |
| هێسا | ئاسان |
| سخ | سەخت |
| برچی | برسی |
| كەڤن | كۆن |
| فـرە | فراوان |
| تاری | تاریك |
| دژڤار | دژوار |

٢ ـ **ئاوەڵنێوی** لە رووی رەگەوە جیاواز :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| رند | جووان |
| تژی | پڕ |
| قۆچاخ | ئازا |
| تەمیز | پاك |
| گران | قورس |
| مەزن | گەورە |
| تەنگ | باریك |
| ڤالم | ســتوور .... (١٠) |
| زۆر | زاڵ |
| قرێژ | چلكن |
| هێشین | سەوز |
| قایـم | شەد .... (١١) |
| ڤیچك | زەرد |
| رژی | لاغەر .... (١٢) |
| خورت | چەرپ |
| چەتن | دژوار |
| تەنگ | تەسك .... (١٣) |

هێندێك **ئاوەڵنێوی** چۆنی وەكو نێو لەبەشی نێــــودا بەكاردێن :

| کرمانجی | سۆرانی |
| --- | --- |
| پیە | پیە |
| بچووك | بچووك |
| مەزن | مەزن (گەورە) |
| قرێژ | چلكن |
| گەرم | گەرم |
| دژڤار | دژوار |
| دەلال | |
| بەدەو | جووان |

كاتێ **ئاوەڵنێوی** چۆنی دەوری **نێوی** دەگیرێ بــە هۆی رێگەی مۆرفۆلۆژی و سینتاكسی‌یەوەیە،بە واتە بە هۆی خستنە سەر وە نیشانەی دۆخەوەیە .

**ئاوەڵنێوی** چۆنی ، كە رۆڵی نێوی دیــــارخراو دەگیرێ ووشەیەكی لێكداراوی دیارخەری دادەرێژی ، ئەوسا ئامرازی خستنە سەری تاك و كۆی پێوەدەلكێ لێرەدا وەكو نێوێك رەفتار دەكات ، بۆ وێنە :

| | |
| --- | --- |
| بەدەوێ | گوند |
| بەدەوا | ژ بەدەوان |
| مەزنێ | قومێ |
| مەزنێ | ئێلێ |
| بەلەنگازێ | شەهەر |
| گەورەی | ئەم خێڵە كێیە ؟ ( هیوا ، ژمارە ـ ٦ ، ١٩٥٧ ) |

| | |
|---|---|
| **دژواری** | **یەکەم ( روناهی ، ژمارە -١- ١٨ )** |
| **هەژاری** | **شار** |
| **بچووکی** | **ماڵ** |

پلەکانی **ئاوەڵناو**

**ئاوەڵناوی** چۆنی رادەی پلەی چۆنیەتی شت وە یا کەس دەنوێنێ ، لەم رووەوە سێ جۆرە **پلەی هەیە** :

**١ ـ پلەی چەسپیو**
**٢ ـ پلەی بەراورد**
**٣ ـ پلەی باڵا**

١ ـ پلەی چەسپیو چۆنیەتی شت دەگەیەنێت بێ ئەوەی پێویست بە بەراورد کردن بکات لەگەڵ چۆنیەتی شتی دی .

٢ ـ پلەی بەراورد چۆنیەتی شتێك بەراورد دەکا لەگەڵ شتێکی دیدا ، بۆ دارشتنی ئەم جۆرە پلەیەش سوفیکسی ( ـ تر ) بەکار دەهێنرێت ، کە بە کۆتایی **ئاوەڵناوەوە** دەلکێت . بۆ پێکهێنانی ئەم پلەیە ئامرازی پێوەندی ( ژ ) لە دیالێکتی کرمانجی وە « لە » لە سۆرانیدا هاو بەشی دەکەن کە دەکەونە پێش ئەو نێوەی پلەی نزمتری پێ دەبەخشرێ لە رووی چۆنیەتی‌یەوە :

**هەسن ژ کەڤر گرانترە . ( کرمانجی )**
ئاسن لە بەرد گرانترە . ( سۆرانی )
**خەبەرا بخێر ژ شەکر چێترە . (ك . )**
ووشەی بەخێر لەشەکر چاکترە . ( س . )

پلەی بەراورد بۆی هەیە بەهۆی ووشە شەوە دابڕێژرێ . بۆ وێنە : «ها» لە کرمانجی وە«هێشتا»ی سۆرانی دەخرێنە پێش **ئاوەڵناوی** چەسپیو و ئەم بارە دادەرێژن :

ئەزێ قیزا دها بەدەو بخوەزم . ( ك . )
**من کچێکی هێشتا جووانم دەوێ . ( س . )**
**ئەوا گوندا دها مەزنە . ( ك . )**
**ئەم لادێ بە هێشتا گەورەیە . ( س .)**

٢ ـ پلەی باڵا

بەرزترین پلەی چۆنیەتی **ئاوەڵناو** دەر دەبڕێ لە چاو شتانی دی .

١ ـ پلەی باڵا بە هۆی ووشەی « **هەرە** » دادەرێژرێ ، کە دەکەوێتە پێش **ئاوەڵناوی** پلەی چەسپیوەوە .

**هەرە شیرن . ( ك )**
**هەرە شیرین . ( س . )**
**ئاڤا هەرە شیرن ( ك . )**
**ئاوی هەرە شیرین ( س . )**

٢ ـ لە سۆرانیدا سوفیکسیش بە شداری دارشتنی پلەی باڵای **ئاوەڵناوی** چۆنیەتی دەکا ، کە ئەویش سوفیکسی ( ـ ترین ) ە

**گوڵنار جووانترین کچە لەم گوندەدا . ( نوری عەلی ئەمین ـ ١٩٦٠ ـ ١١٦ )**

**٣ ـ لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا بۆ** دارشتنی پلەی باڵا (لاپ) بەواتە هەرە ، زۆر هاوبەشی **پێك هێنانی دەکات .**

**لاپ درێژە .**
**ئەوا قیزا لاپ چەلەنگە .**

بەهێزترین پلەی باڵای **ئاوەڵناوی** چۆنی ، ئەو **ئاوەڵناوەیە** ، کە سوفیکسی **ئاوەڵناوی** لەگەڵدا بەکار **دەهێنرێت .**

سوفیکسی ( ـ ۆتانکی ، ـ ۆکی ، ـ ۆلەکی ) لە سۆرانی وە ( ـ ۆلە ، ـ ەلە ، ـ یلە ) لە کرمانجی ، کە دەچنە سەر **ئاوەڵناوی چۆنی** ، لە رووی پلەی چونیەتی‌یەوە پلەی نزمتر دەبەخشن .

**کرمانجی**

**آ ـ رەشۆتانکی ، سۆرۆتانکی ، ترشۆتانکی ، شۆرۆتانکی ، تالوتانکی**
**ب ـ ڤیچۆلەکی ، سۆرۆلەکی ، رەشۆلەکی**
**ج ـ ڤرێژۆکی ، زەرکۆلە(ی) ، رەشکۆلە(ی)**

**سۆرانی**

نەرمۆڵە ، خنجیلە ( قنجیلە ) ، سپیکەڵە رووتەڵە ، بچکۆڵە و .... هتد

کاتێ **ئاوەڵناو** پلەیەکی بەرز وباڵاو زۆری چۆنیەتەکی دەبەخشێ ، بەرێگەی دووپاتکردنەوەی **ئاوەڵناوەکە** دا دەرێژرێ ، لەدیالیکتی کرمانجیدا سوفیکسی (ـی) و(ـۆتانکی)یش لەگەڵ **ئاوەڵناوەکەدا** دووبارە دەبێتەوە :

١ ـ دووبارە کردنەوەی سادە ، کە بەرێگەی دووپاتکردنەوەی ئاوەڵنیوەکە یە لە دوو دیالیکتەکەدا :

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **سۆر ـ سۆر** | **سوور ـ سوور** |
| **رەش ـ رەش** | **رەش ـ رەش** |
| **سار ـ سار** | **سارد ـ سارد** |
| **هوور ـ هوور** | **ووردە ـ ووردە.(١٤)** |

٢ ــ بە دوو بارە کردنەوەی **ناوەلنیوەکە** بە یارمەتی سوفیکسی (ــی) ، کەتەنیا لە کرمانجیدا بەر چاو دەکەوێ :

**سوری ــ سور**
**رەشی ــ رەش**
**تالی ــ تال**

٣ ــ بە دوو بارە کردنەوەی ناوەلنیوەکە بە یارمەتی هەردوو سوفیکسی (ــی) وە (ــۆتانکی) کەتایبەتە بە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان : ــ

**رەشی ــ رەشۆتانکی**
**سوری ــ سورۆتانکی**
**تالی ــ تالۆتانکی**

٤ ــ لە دیالیکتی کرمانجیدا چەند **ناوەلنیوێک** هەن ، کەئەم پلەبەیان بە هاوکاری سوفیکسی ( ــی ، ــکی ، ــ ۆکی ) دا دەرێژرێن ئەم سوفیکسانە دەچنە سەر **ناوەلنیوی** دووەم لە رووی واتاوە هیچ جیاوازی یان نی یە وە هەموویان پلەی هەرە بەرزی چۆنیەتی دەبەخشن :

**قول ــ قولی ، قول ــ قولکی ، قول ــ قولۆکی**
**سور ــ سوری ، سور ــ سورکی ، سور ــ سورۆکی ٠٠٠ (١٥)**
**رەش ــ رەشی ، رەش ــ رەشکی ، رەش ــ رەشۆکی**
**تال ــ تالی ، تال ــ تالکی ، تال ــ تالۆکی ٠٠٠ (١٦)**
**هوور ــ هووری ، هوور ــ هوورکی ، هوور ــ هوورۆکی**

**« ناوەلنیوی نسبی »**

**ناوەلنیوی** نسبی بنچینە و نەسلی بابەت و کەرەستە بۆ شت دەگەرێنیتەوە . لە زمانی کوردیدا **ناوەلنیوی** نسبی بەهۆی مۆرفولۆژی و لێکدانی وشەوە دا دەرێژرێ .

**ناوەلنیوی** نسبی بەهۆی سوفیکسی ( ــی ، ــ ۆکی ، ــ ین ) دادەرێژرێ ، کە بە کۆتایی هێندێک بەشەکانی ئاخافتنەوە دەلکێ :

١ ــ **ئەو ناوەلنیوەی** ، کە بەهۆی سوفیکسی نسبی (ــی) دادەرێژرێ ، واتەی نەسل و بنج و بناوان دەگەیەنێت ، لە هەردوو دیالیکتەکەدا هەیە .

کوردی ، عەرەبی ، دەشتی ، بارزانی ، گۆشتی ، گەنمی .

٢ ــ ئەو **ناوەلنیوە** نسبی یەی ، کە بەهۆی سوفیکسی (ــین) ، وە دادەرێژرێ و جۆری بابەتەکە دەردەخات کە شتەکەی لێ دروستکراوە :

زێرین ، ئاگرین ، ئاسنین ، خوێنین .

٣ ــ ئەو **ناوەلنیوە** نسبی یەی ، کە بەیارمەتی سوفیکسی (ــۆکی) دادەرێژرێ : ــ

لە دیالێکتی کرمانجیدا بە یارمەتی ئەم سوفیکسە هێندێ **ناوەلنیو** لە بناخەی کارەوە دادەرێژرێ :

گەرۆکی ، شمتۆکی پێرتوکی زەلقوکی ، زەرقۆکیو ... هتد

٤ ــ **ناوەلنیوی** نسبی بەهۆی پاشگری (ــین) وە واتای ماوە و کات دەگەیەنێت ، ئەم هۆیە تەنێ لە کرمانجی ژووروودا بەرچاو دەکەێ پاشین ، پێشین شەفین ، رۆژین ، سالێن وە ... هتد .

**ناوەلنیوی** نسبی بەهۆی ئامرازی ( نە ــ ، نا ــ ) وەپێشگری ( ــبێ)دا دەرێژرێ ، کە دەچێتە سەر نێو ، بناخەی‌کار وە هێندێ **ناوەلنیوی** چۆنی :

١ ــ **ناوەلنیوی** نسبی ، کە بە یارمەتی پێشگری (ــبێ) وەدارێژراوە :

بێ‌مال بێ گیان ، بێ‌ناف ، بێ‌ناو ، بێ‌پار ، بێ‌بەش

٢ ــ **ناوەلنیوی** نسبی ، کە بە یارمەتی ئامرازی ( نە ــ ، نا ــ ) لە سورانیدا وە ) ــ نە( لە کرمانجیدا دارێژراوە ، ئەم ئامرازانە دەچنە سەر نێو یان بناخەی کار :

| **کرمانجی** | **سورانی** |
|---|---|
| **نەراست** | **ناراست** |
| **نەساخ** | **ناساغ** |
| **نەخوەش** | **ناخۆش** |
| **نەتێر** | **ناتێر** |

٣ ــ پێشگری (نەــ) دەچێتە سەر نێوی بکەر و نێوی کراو ، **ناوەلنیوی لی دا** ــ دەرێژرێ :

| **کرمانجی** | **سورانی** |
|---|---|
| **نە مری** | **(نەمر)** |
| **نەهاتی** | **نەهاتوو** |
| **نەکەتی** | **نەکەوتوو** |
| **نەخوەندی** | **نەخوێنراو** |
| **نەکری** | **نەکراو** |
| **نەنڤیساندی** | **نەنوسراو** |

بۆ دارشتنی **ناوەلنیوی** نەسادە بە زۆری رێگەی

لێکدانی دوو بەشی ئاخافتن نێو ، ژمارە ، **ئاوەڵنێوی** چۆنی ) بەکاردێت و لێک دەدرێت . تایبەتیی ئەم جۆرە **ئاوەڵنێوانە** وەکو **ئاوەڵنێوی** کە واتەی بەڵگە و نیشانەی بابەت و شت دەبەخشێ :

١ ــ ئاوەڵنێو + نێو . ( ئەم جۆرە دارشتنە زۆرە ) .

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **رەش بەخت** | **رەش بەخت** |
| **خراب مال** | **خراپ مال** |
| **خوەش بەخت** | **خۆشبەخت** |
| **پاکدل** | **پاکدڵ** |
| **کێم پیر** | **کەم پیر** |

٢ ــ **ئاوەڵنێو** + **ئاوەڵنێو**

ئەم جۆرە دارشتنە کەم بەکار دێتەوە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا هەیە وەک :

کەسکە سۆر

سۆر ، شین ، ترشەتاڵ ، سۆرەسپی ، شۆرەتاڵ

٣ ــ **نێو** + **ئاوەڵنێو**

( ئەم جۆرە دارشتە لە زمانی کوردیدا زۆر باوە و بەرهەمدارە )

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **چاڤ رەش** | **چاورەش** |
| **خوون شیرین** | **خوێن شیرین** |
| **دلسار** | **دڵسارد** |
| **بەخترەش** | **بەخت رەش** |
| **گۆدرێژ** | **گوێدرێژ** |

٤ ــ نێو + نێو ( ئەم جۆرە دارشتنە کـــەم بەکاردێت ) .

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **خودان خێر** | **خاوەن خێر** |
| **خودان بەخت** | **خاوەن بەخت** |

٥ ــ ژمارە + نێو ( ئەم جەشنە دارشتنە زۆرە )

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **دوقات** | **دووقات** |
| **دوبەر** | **دوولا** |
| **چارگۆشە** | **چووار گۆشە** |
| **یەک دەنگ** | **یەک دەنگ** |
| **یەکرۆژ** | **یەک رۆژ** |

٦ ــ نێو + رەگی کار (ئەم دارشتنەش زۆرە)

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **خێرخواز** | **خێرخواز** |
| **خووندرێژ** | **خوێن رێژ** |
| **مێرکوژ** | **پیاوکوژ** |
| **دەستنڤیس** | **دەست نووس** |
| **براکوژ** | **براکوژ** |

٧ ــ **ئاوەڵنێو** ( ئاوەلکار ) + رەگیکار (ئـــەم دارشتنە کەمە )

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **دووربینی** | **دووربینی** |
| **خوەشگو** | **خۆشگو** |
| **راستبێژ** | **راستبێر** |

نێوی ــ دیارخەر ــ لە ووشەی لێکدراودا لـــە ئەرکی رێزمانیدا لە **ئاوەڵنێوی** نسبی نێزیکە .

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **ژناکورد** | **ژنیکورد** |
| **خانێی مەرمەر** | **خانووی مەرمەر** |
| **رێاهەسن** | **رێگەی ئاسن** |
| **ئەسکەرێ دژمن** | **لەشکری دژمن** |
| **مالا زەرویان (زەرووان)** | **مالی منداڵان** |
| **کنچێ ژنان** | **جلی ژنان** |
| **حەماماژنان** | **حەمامی ژنان** |
| **دەنگێ کەچکان** | **دەنگی کچەکان** |
| **مغازاکتێبان** | **مغازەیکتێبان** |

ئەو نێوەی ، کە جێنێوی ( یا ، آ ) ، یێ(ێ) ، یێد (بێت) ، یێن (ێن)ی کە کرمانجی وە (ی ــ هی ــ) لـــە سۆرانیدا بە پێش دەکەوێ لە رووی ئەرکی رێزمانی بەوە وەکو **ئاوەڵنێوی** نسبیە .

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **یێ دەولەتێ** | **ی دەولــــەت (ی) ، (هیدەولەت)** |
| **یێ دژمن** | **ی دژمن ، هی دژمن** |
| **یێد مالێ** | **ی مال ، هیمال** |
| **یێد چۆلێ** | **ی چۆل ، هی چۆل** |
| **یێد شەهەر** | **ی شار ، هی شار** |

ئاوەڵنێو لە رستەدا رۆلی سینتاکسی دەگیرێو

دەبێتە دیارخەر ، نیهاد ، بەرکار وە گوزارە

لە رۆلی ئەتریبوتیڤدا (دیارخـــەر)دا ئاوەڵنێو دەکەوێتە دوای نێوی دیار خراوەوە . کۆتایی **ئاوەڵنێو** بە پێی ئەو نیوەی لەگەلی دێت ، رێک دەکەوێت یان هەر وەکو خۆی دەمێنێتەوە .

١ ــ لەم ووشە لێکدراوانەی خوارەوەدا نێـــو دەوری دیارخراو وە **ئاوەڵنێو** دەوری دیـــارخـــەر دەگێرێ :

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **مالامەزن** | **مالی گەورە (مالی مەزن)** |
| **دارابلند** | **داری بەرز (داریبلند)** |
| **خانێیسۆر** | **خانووی سوور** |

**ئاوەڵـــــــنێو** دەوری نیهاد بەرکـــــــــار ، ( adverbial ) یش دەگێرێ . لەم رۆلانەدا نیشانەو دۆخی تایبەتی خۆی دەبێ .

١ ــ **ئاوەڵنێو** لەرۆلی نیهاد دا :ــ

تا پیرێك دەمرێ ، هەزار جوان ئەمرێ .

دەولەمەند چوون لێزارمان

٢ ــ **ئاوەڵنێو** لە رۆلی بەرکار دا :ــ

من ئەڤا کتێبا نڤیسیە بۆ بچووك و مەزنان .

من ئەم کتێبەم نووسیوە بۆ گەورە و بچووك .

با بلێین هەندێ لە پیرەکان خراپن .

بلا بێژن هنەك ژپیران خراپن .

٣ ــ **ئاوەڵنێو لە** رۆلی گوزارەدا : ( لـــەگـــەل پێوەندیکارا بەوالە دەبێتە بەشێك لەگوزارەی نێوی )

| **کرمانجی** | **سۆرانی** |
|---|---|
| **دیوار رەشە** | **دیوار رەشە** |
| **خانی بچووکە** | **خانوو بچووکە** |
| **دیوار رەشن** | **دیوار رەشن** |

لە کۆتاییدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ، کەوا لە زمانیکوردیدا هۆی ــ پەرەسەندووی مۆرفۆلۆژی بۆ چۆنیەتی دارشتنی **ئاوەڵنێو** نییە ، لەگەل ئەوەشدا **ئاوەڵنێو** بە بەشێکی ئاخافتن دەژمێررێ ، چونکـــە تایبەتێتی مۆرفولوژی و سینتاکس و واتایی خـــۆی هـــەیـــە .

**پەراوێز و سەرچاوە :ــ**

(١) ف جوستی ، رێزمانیکوردی ، ١٨٨٠ل ــ ٦٩ .

(٢) ر.ف ، جاردن ، کرمانجی بادینان ، بەغدا ، ١٩٢٢ ، ل ــ ٦٨ .

(٣) د.ن. مەکـــــەنزی ، لێکۆلینەوەکانـــــی دیالێکتەکانی کوردی لەندەن ، ١٩٦١ ، ل ــ ٧١

(٤) ی.ن. مەکاروس ، رێزمانیکوردی ، نیویورك ، ١٩٥٨ ، ل ــ ٧٣ .

(٥) ل.ۆ ــ فۆسۆم ، رێزمانیکوردی ، مینەپۆلس ١٩١٩ ، ٦٥ .

(٦) **ئاوەڵنێوی** «کۆر» لە بەشە دیـــالێکتـــی هەولێریشدا بەکاردێت بەرامبەر بە «کوێر» .

(٧) **ئاوەڵنێوی** «نێزیك» لە بەشە دیالێکتی هەولێر و موکریشدا بەکاردێت بەرامبەر بە «نزیك» .

(٨) لەهیندێ ناوچەی کرمانجی خواروودا بەرامبەر بە «ڤالا» دەلێن «والا» .

(٩) لە بەشە دیالێکتی موکری و هەایردا **ئاوەڵنێوی** «شیرن» بەکاردێت .

(١٠) **ئاوەڵنێوی** «ستوور» لەگەل ئەو بەشـــەشـــدا باسکراوە ، کە لە هەردوو دیالێکتەکەدا لــــە رووی فونێمەوە یەکن .

(١١) بەرامبەر بە **ئاوەڵنێوی** «قایم» کە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا بەکاردێت هەر «قایم» وە «توند» لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا هەیـــە «شەد»م نەبیستووە .

(١٢) فارسی دەلێ «لاغەر» کورد دەلێ «لاواز» .

(١٣) لەگەل**ئاوەڵنێوی**«تەسك»لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا «تەنگ»یش بەکاردێت وەکو«تەنگ»ی دیالێکتی کرمانجی ژووروو .

(١٤) لە دیالیکتی کرمانجی خواروودا (وورد ــ وورد ) (هوورد ــ هوورد ) یش دەلێن .

(١٥) لە بەشە دیالێکتی بادیناندا بەهۆی پاشـــکری (ـــوو) دادەرێژرێ : سورروو ، رەشوو ...

(١٦) لە بەشە دیالێکتی بادیناندا بەیارمەتی پاشکری (ـــوکە) دادەرێژرێ : تەحلوکە ....

سەرنج :

ئەم بابەتەم لە بەرهەمە بەنرخەکـــەی دکتـــۆر قەناتیکوردۆ هەلبژاردووە ، کە بە **نێوی** رێزمانی کوردییە ( دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی ) ، بەزمانی روسی نوسراوە ، لـــە مۆسکۆ ، لەسالی (١٩٧٨) دا چاپکراوە ، باسەکە لاپەرە (٧٨ــ٨٦) ئـــەم کتێبەی گرتۆتەوە .

# چەند لایێن ڤەشارتی د سترانا کوردیدا

سكڤان عبد الحكيم

ئەگەر ئەم بچاڤەك هوبرو ئویرو دوبر سەحكەینە سترانا كوردیو ژدل خەمێ ژێ بخوین دێ گەلەك لایێن ڤەشارتیو نەدیار و نەئەشكەرا تێدا بینین ژبەر كو هەتا ئەڤروكە كەسێ ژتورەڤانێن كوردو رۆژهەلات ناسێن بیانی بلرستی ئەڤ لایە ژئورێ كوردی نەگرتی یەو بێ پویتە بۆ .. ڤێجا هەكە بەرێ خۆ بدەینە دورم و بەرێ دخۆ وملەتێن خەلكێ دێ هینكێ زانین كا چەند ئەم دپاش كەفتینە كمو چەند خاڤین كو مە ئەڤ لایە ژپشت گوهێ خۆ هاڤێتیە .. ومە چوجارا بزاڤ و ڤاندنەك نەكریە داكو ئەم رەنگێ راست و زەلال ژسترانا كوردی وەرگرینو بخۆ فایدەی و قازانجێ ژێ بكەین هەر چەند گەلەك خالو نیشانێن ساهی هەنەو گرێدانەك كم دگەل دیروكا ملەتێ مە ژی هەیەو شلوڤەكرنەكە ژبو هندەك قوناغێت ملەتێ كورد تێدا بوری‌یە هەر دیسا خویا كرنەكە بۆ چیروكو سەرهاتێن مە ژبلی هندێ‌ژی بەرسڤەكە بۆ رەوشتو عەدەتێت ملەتێ مە ورێكا ژینا وێ ژیو .. دڤێرەدا پێتڤیە ئەم لگەل سترانا كوردی پاقژ بین چنكو ستران لگەل ملەتێ مە پاقژ بوە .

لسالا ١٩٢٨ سترانبێژا كورد ( فرحە ) ناڤێ وێ پادرستی‌یە بەلێ دگوتنێ « ددیكا جەمالی » گەلەك ستران تومارکرن سەر قەوەنا بۆ كومپەنیا ( اودیون ) و ئەم دشێین بێژین كو وێ دەست بسترانا رامیاری كر ژژنكا وەختێ سترانا ( شێخ سعید ) گوتن و تێدا بەمسا باپیرێ ( شیخ محمود الحفید ) دكر گەلەك سترانێن وی گوتن بەلێ پشتی شویكری مێرێ وێ رابۆ هەمی قەوەنێت وێ كومكرنو پیچ كرن بەلێ سترانەك بتنێ ما هەتا گەهشتی‌یە رادیوا كوردی ئەوژی ناخێ وێ ( هەی‌بەلارو هەی‌بەلار ) و ئەوێ دیتی دبێژیت هندا جان بۆ ژبەر هندێ ناڤێ وێ‌كرنە « دەیكا جەمالی » و هەیڤا سێ دئەڤسالەدا گەلەك سترانێن وێ « مریم خانێ » و « كاریس ئاغای » برایێ هێژا كاك « امین حویزی » ژخەلكێ كۆیە ئیناندنە رادیوا كوردیو ئەوستران كەسێ گولێ نەبوینە هەتا نهو .. و هاتە زانین كو ئێك هەبۆ ناڤێ وی « میناس » بو ستران بۆ « دەیكا جەمالی » درست دكرنو .. « كاویس ئاغای » ئەوێ بسترانا خۆ ( شیخ محمود ) بناڤودەنگ بوی چنكو هندەك برایا دبوت ئەو سەركێشێ سترانا رامیاریا كوردی‌یە بەلێ نهو « دەیكا جەمالی » ژبەروی دەركەت .. « كاویس ئاغا » پێلال بو بەلێ نەبلرستی یانكو ( ترتری ) بوو هەكو دئاخفت قەسە بلرستی ژدەڤی نەدمردكەفتو كی‌یێ مال خۆش بو چنكو بازرگانی دكر ئو رۆژەكێ ژرۆژا « نسرین شێراونێ » گوتێ : من دڤێت ئەز سترانەك تە بێژم ئینا گوتێ بكێرتە نە ناهێن و هەكە ئەز نەبم كەس نەشێت ڤان سترانا بێژیتو رۆژەكێ داوەنەك لمالەكێ هەبوو لمیسل « حەسوێ جزیری » دگەل « نسرین شێروانی » چوونە میسل داپشكدارێ لڤێ داوەتێ بكەنو لوێرێ « كاویس ئاغا » دیتن و داچنە دەستێ ئینا وی گۆتە وانا هەرن هەرن ، دەستێ خۆ نەداڤ واناو گوتە حەسویو نسرینێ هەرن هۆن دزی‌كەرن ، ژبەر چی وەگوت كەسێ نەزانی ، كاویس‌ئاغا باوەریا خۆ گەلەك داناسەر فولكلورێ كوردیو هندەك چیروكێن كوردی یێن كەڤن كرنە ستران وەكی گەنج خەلیلو خورشیدێ چاڤ بخالو .. گەلەك سترانێ دی ژوان سترانبێژێن كەڤن یێن هاتین بەغدا سترانێن خۆ توماركرین لكومپانیێت بەغدا لوی وەختی‌دا وەكی كومپەنیا ( بیضافون .. اددیون ابو كلب كولومبیا ) .. مەگوت ژوان سترانێژین سترانێن خۆ لوێرێ توماركرین ئەڤەبوون : ( حسین كویسنجقی .. مریم خان .. كاویس ئاغا .. عزیز ئاغا . طاهر زاخولی .. درویش عیسی .. الماس محمد محمد مندو .. دەیكا

جەمالی .. نسرین شیراون .. محمد عارف جزیری.. حەسوێ جزیری ..فوزیە محمد . علی خنجر شنگاری .. ) دبێژن کو علی خنجر شنگاری بەری هەمیا قەوەنە تومارکرن پشتی سالا ١٩٢٥و عەزیز ئاغای چەند ستران تومار کرینو لجزیرێ چۆ بەر رەحمەتا خۆدێو ـ غفور ئاغا ژ سابلاغێ هاتبوو .. و پشتی رادیوا کوردی لبەغدا هاتیە ڤەکرن لسالا ١٩٣٩ گەلەك رژنکێت سترانبێژ هاتنە رادیوێ وەکی « اسمر فرهاد » و ئەڤ هەردوو کچێت هەجهی بوون ژدەڤەرا سورچیا هاتبون لسالا ١٩٤٨و نێزیکی «٩» سترانا گوتنو نەمان .. بەلێ هندەکێن دی دبێژن کو نازدار ڤەلەبووەو لسالا ١٩٥٧ ژی جارەکێ هاتە رادیوێو نوکە ساخە .. بەلێ « فوزیە محمد » بەری سالا ١٩٤٤ هاتە رادیوێو نێزیکی ١٥ سترانا گوتن ، لسالا ١٩٥٣ « الماس محمد » هاتە رادیوێو سترانێن کێم گوتن چنکو مالێ وێ خۆش بوویەلێ مالاوێ ڤەکریبوو ،ژهەمی سترانبێژێت کوردو سەدایرێ شەهیانە دکرنو گەلەك مەردبوو ژبوو پاراستنا سترانا فولکلوریێا کوردی چنکوێ « نسرین شێروان »هنارنە رادیوێ لسالا ١٩٤٥و سترانا خۆ یا ئێکێ گوتی (جزیرێ جزیرێ)و هندەکا گولێ ببوو ژدەڤێ سترانێژێ کوردی بناڤو دەنگ « حسن زیرەکی » کو ئەو گەلەك مەژ دەنگێ « نسرین شێروانێ » دکەت بەلێ موخابن نەزانیە چەوا بکاربینتو « نسرین شێروانێ » ژهەمی سترانێژێت کورد پتر سترانێن هەین لرادیوا کوردیو لسالا ١٩٧٥ تەقاعد دەرکەت .. لڤێرە داقەستا « گولبهارێ بکەین لسالا ١٩٤٩ دەست بهونەرێ کر بەلێ بئەزمانێ عەربی سەر شانوێ گەل مەزنترین ئەکتەرتین عیراقی وەکی « حقی لشبلی » و «یوسف العانی» و «عبدالله العزاوی» و «وجیە عبدالغنی» بشکلرای بسێ فیلمێت عیراقی کریەو گەلەك تەمسیلێت عەرەبی دەرکەفت هەتا سالا ١٩٦٧ و پشتی سالا ١٩٧٠ گەلەك جار چوکەو دەرڤەی عیراقێ چنکو وێ بدرستی لسالا ١٩٦١ دەست بسترانا کوردی کرو جارا ئێکێ سترانا ( کورێ گوندی) گوتیو هەتا نۆکە بەردەوامە و لسالا ١٩٦٤ «ژیان محمد» ئەوا کو ناڤێ دێ «بلقیس عەلی»یە بدرستی هاتە رادیوێو نێزیکی «٥»سترانا گوتن هەر دیسا گولیزار ژی هات لسالا ١٩٦٣ و سێ ستران تومارکرنو پشتی هینگ شوی‌کرو ..

دبێژن لسالا ١٩٦٣ شەهیانەك هاتە گرێدان لهولا خولد بهەلکەفتا جەژنێن نەڤروزێو لوێرێ «عائشە» هاتبوو شرین بهارەو بەستا وەی وەی زارا گوتی ئینا بلەزیکی ڤەهاتنە تومارکرنو هەتا ئەڤەوژی تێنە لێدان بەلێ دڤێت ئەم ژبیرنەکەین کو بەستا (هەی لا لمن غەریبێ) « مریم خانێ » ژبەری « محمد عارف جزیری » گوتییە هەر وەسا سترانا دەردو « مریم خانێ » ژبەری « تحسین طه » ڤەگوتییە بهزرا من وێ ژ هەردووکا خوشترێ گوتیو ژسترانبێژێت کەڤن یێن کێم کەسێ گولی‌بوین ( عبدالعزیز محمد) دوو سترانێن هەین و (محمد ارنوسی) ئەوی ژی دوو سترانێت هەین ..

وژسترانێت کوردی یێن کەڤن گەلەك ببهاو نەرخ چەند سترانەکەێن «حەسەن زیرەکینە» «محمد عارف جزیری» تەنبیرێ بۆ لێدایو چەند سترانەك دوو قولی یان سێ قولی یێن هاتینە گوتن بۆ نمونە سترانا گول شێنی «مریم خانێ» و «الماس محمد» پێکڤە گوتینەو سترانا قومریك ژی الماس محمد و مریم خانو حەسەن جزیری گوتینە ..

ئەڤ چەند رێزە بهزرا من وێ بنە دەرگەهەك ژ بو ڤەکولینا سترانا کوردی هێشتا بدرێژاهیو هەکە خودێ ژمن بینیت وێ بدرێژی نێسمو ئەڤە هندەکە ژ گوتارەکێ لدویف دافازیا ئێکەنیا تورەڤانێن‌کورد لدهوکێ بئاناهیا خودێ دێ‌خوینم .

---

**ژێدەر**

١ ـ چاڤپێکەفتنەك دگەل فوزیە محمد
٢ ـ چاڤپێکەفتنەك دگەل گولبهارێ
٣ ـ چاڤپێکەفتنەك دگەل نسرین شێروانی
٤ ـ چاڤپێکەفتنەك دگەل کاکە امین حویزی
٥ ـ سترانبێژ خلیل ئاکرەی و خلیل ابراهیم بومن ئاخفن
٦ ـ محمد عارف جزیری بومن ئاخفت
٧ ـ ئاخفتن دگەل علی مەردانی



# کەمالی باپیر ئاغا

## چەند سەرنجێك و پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوەیی

[ عەلی کەمال باپیر یەکێکە لە کە لە شاعیرەکانی کوردو یەکێکە لە پەیرەو کەرە گەورەکانی ڕێبازی ئەدەبیی دەوری بابانو ڕەنگە دووا دەنگی دلێری دیمەن دەربری ئەو قوتابخانە بێت .

ئەم شاعیرە گەورەیە ، لە پاڵ بەرهەمی شیعری پڕ سۆزی خۆیدا ، گەلێك بەرهەمی وەرگێڕراویشی بە کوردی هۆنیوەتەوەو لە کۆڕی ڕۆژنامەگەریو کۆششی سیاسیشەوە ، ئلوێکی گەشەدەرای سەردەمی حوکمڕانیی شێخ مەحموودی حەفیدەو یەکێکە لەو ڕوشنبیرانەی لەو سەردەمەدا دەوری ئەو سەردارە مەزنەیان گرتبوو .

ئەم ووتارە تەنیا هەندێك لایەنی شاعیرێتیی کەمالی دەردەخاتو سەرەتایەکە بۆ باسێکی فراوانی ژیانو بەرهەمی کەمالی ]

شاعیر بەچەند دێڕێکی دیار جێگەی خۆی لە ڕیزەود پەیڕەوی ئەدەبیاتی کوردیدا دەردەخاتو دەڵێت

لە ڕیزی شاعیرانا بۆیە من
ئەمڕۆ سەر ئەفرازم لە
شاگردانی بەزمی حەزرەتی
مەحویی شەکرڕازم لە پاش
مەحوی هەمیشە پەیڕەوی سالم
ئەکەم لاکین بە دل زۆر عاشقی
هەڵبەستی ناریی بێکنە پەردازم
لە دیوانی ئەدیبانی هەموو ئێرانیانا
من
غولامو عەبدی حافز ، خواجە
شەمسەدینی شیرازم هەر بۆ
تەواوکردنی ئەم جێگە

دەستنیشانکردنە دەڵێت :

پەیڕەوی ( حەمدی ) ئەکەم دایم
( کەمالی ) بۆیە وا ویردی خاسو
عامە ئەشعاری تەرەب ئەفزایی من

شاعیر لێرەدا بێجگە لە وەی جێگەی خۆی دۆزییەوە ، زنجیرەو ڕێڕەویکیشی بۆ شیعری چەرخێکی کوردەواری نەخشەکێشا . خۆی بەست بە مەحویو سالمو (١) حەمدییەوەو بووە هەواخواو هاوشانی ناریو لەودیو ئەم جیهانە کلاسیکییەی ئەمانەوە چووەوە سەر بنەرەتێکی کاریگەری ڕۆژهەڵاتو خۆیو ئەوانی بەست بە حافزی شیرازییەوە .

کەمالی تەمەنێکی درێژی بردەسەر، بەلام ڕێبازی ئەدەبیی ئەو هەر ئەوی سەرە تابوو ، هەر لەو چوارچێوەیەی سەرەتای شیعرو ڕوخسارە دەنگدارە کانیدا بوو . ئەگەر خۆیو شیعری کوردیی بردبێتەوە سەر بناغەی حافز (٢) ، ئەوا شاعیرانی تری فارسی بەهاوشانی خۆی زانیوە .

**لە ناو کوردی عیراقا ئەی کەمالی**
**شیعری ڕەنگینت**
**ئەوەن مەرغووبە هەر وەك شیعری**
**قائانی لە ئێرانا**

**شاعیر تا دوایی هەر لە سەر ئەو پەیڕەوە بوو ، لە ڕوخساری شیعری کلاسیکی لای‌نەدا، گوێی لەو تەوژمی تازەبوونەوەیەی دەوروبەری نەبوو ، ئەم گوێ پێ‌نەدانە نموونەی شانازیی شاعیرێکە ، کە پتەویی گەرمەو دەسەڵاتی هونەرمەندانەی وای بە بابەتەکەی خۆیەوە ببەستێ کە لێی لانەداو هەموو لادانو تازە کردنەوەیەکی لا پەشم بێت :**

**کەوا پارچەی غەزەلیان نەبری بۆ**
**یار سالمو مەحوی**
**کەچی ئێستاکە وا خام چاو نەبینم**
**بەرگی دلدارە**

**دیمەنی شانازیو باوەڕو هێزو هەست بە خۆ کردنی هونەرمەندانەی کەمالی لە زۆر لە شیعرەکانیدا دیارە .**

**ئەم شانازییە کەمالی دوو ڕێچکە دەگرێت . شانازی بە کەمالی شاعیرەوەو شانازی بە کەمالیی مرۆڤەوە .**

**کەمالی شاعیر بە شیعرەکانیەوە دەنازێت ، ئەوە بوو**
**لە ڕیزی شیعری کوردیو بەرهەمی**

ڕەنگینا جێگەی کردنەوەو
کردنی بە مایەی شانازی بۆ کەماڵی
ئادەمیزاد .
کەماڵی ئادەمیزادیش شانازی بە
هەندێك بیروڕای
خۆیو فـەلسەفـــەی ژیانــــیو
قەلەندەرییو ڕەوشتی
خۆیەوە دەکاتو دەیانکات بە مایەی
بەختیاری ژیانی
خۆیو بە هۆی ویژدان ئاسوودەیی
خۆی .
دەربارەی شیعری خۆیەتی ، کــە
ووتوویەتی :

**سیحرە ئەشعاری بـەلیغت ئـــەی**
**کەماڵی ئافەرین**
**قیمەتی شیعری هـەزاران شاعیری**
**غەمرات شکاند**

یا ووتوویەتی :

**لە دنیا نرخی قەندو شـــەکر (٢)**
**ئەشکێ بێشكو شبهە**
**ئەگەر ببیەن کە لامو لەفزی جوانو**
**شیعری ڕەنگینم**
**بەخوێنی جەرگەکەم دەستی کـــە**
**ڕەنگین کرد نیگار فەرمووی**
**( کەماڵی ) سەیری‌کە چۆن جوانـە**
**سەرپەنجەی نیگارینم**

یا ووتوویەتی

**کەماڵی بۆ نیساری مەقدەمی جانان**
**تەماشاکە**
**لە ئەشعارم دوڕو گەوهەر قەتـار**
**ئەندەر قەتار ئەڕوا**

دیسان ووتوویەتی :

**گوێ مەدە قەولی حەسوودی بـەد**
**(کەماڵی) شیعری تۆ سافو شیرینو**
**ڕەوانە هەر لە شەکرو شیر ئەکا**

لە شیعری کەمالیــدا نموونەی زۆر
فراوانی تر بۆ ئەم
دوو مەبەسە دەدۆزینەوە ، واتـــە
شانازیی شاعیر بە
هونەری خۆیەوەو شانازی مرۆڤ بە
هەموو ئەو ڕەگەزانەوە
کە مرۆڤایەتیی ئەوی لە ناوکۆمەڵدا
چەسپاندووە .
شاعیر لەو شانازیەوە دێتە سەر
فەلسەفەی تایبەتیی
خۆی دەربارەی ژیانو کۆمــەڵو
باوەڕو خێرو ڕەوشتی مرۆڤانە
شاعیر ووتوویەتی :

**نانی ڕەنجی شان ئەخۆم ، وەك تۆ**
**هەوای جاهم نی‌یە**
**ترسی عەزلـــیو خـــەوفو بیمی**
**حەزرەتی شاهیم نی‌یە**
**بۆ فەلەك ناکەم تەنەزول ، چونکە**
**زۆر دوون پەروەوە**
**ئیحتیاجی شەوقی ڕۆژو پرتـەوی**
**ماهم نی‌یە**
**دەس درێژم گەهە لە بەغدا ، گەهە**
**لە تارانا ئەژیم**
**حوڕو ئازادم دەسی بەسراوو گوناهم**
**نی‌یە**
**بەسمە من ئۆبالی مەزلوومان**
**ئەچێتە گەردنم**
**تاقەتی باری حقووقو ئاگری ئاهم**
**نی‌یە**

لەم دێڕانەدا بــەردەوامی
وەسفی ئەو ژیانی قەلەندەرایەتی‌یە
دەبینی کە بۆ خۆی پەسند کردووەو
کردوویی بە پەیڕەوی ژیانی خۆی‌ی
لە زۆر شـیعریدا ئــەو وەسفەی
ڕەنگی دابۆوە :
تەنانەت لێرەدا هاوارێکی پڕ لــە
شاعیرانە بەرامبەر بــە زوڵـــمو
ناتۆڵایی‌و دیمەنی ناڵەباری ژیــان
دەبیــتن .
لێرەداو لە زۆر دێڕی تری بەرهەمی
کەمالیدا ، ئەگەی ئەوەمان دەســت
دەکەوێت کە شاعیری پێ ببەینـــە
ریزی شاعیرانی مرۆڤ پەرستەوەو
بیکەین بە دەنگێکی هەڤ خواهـی
دوژمنی ناهەقو دۆستی زوڵــم
لی‌کراوان دوژمنی زۆرداران .
ووشەی شاعیر هەمیشـــە ووشەی
پاکی هەڤ پەرستی‌یە . تیرێکـــی
بەکارە جەرگی تاریکــیو زۆرداری
دەسمێ .

(کەمالی) وەك زوربـــەی شاعـیرە
کلاسیکی‌یەکان کاتێك دەیەوێ لـــە
ناکۆکی‌یەکانی کۆمەڵو ناتۆڵایی باری
ژیان بدوێ ، فەلەك دەکاتە نموونەی
ئەو ناڵەباری‌یانەو دەنگی ناڕەزایی‌و
پرۆتێستۆی بەرامبەر دەردەبڕێت .

**ئاسمانی دوون هەمیشـــە ، دوون**
**پەرستی کاری‌یە**
**سەرســـەری‌و ئەحمەق ئـــەوازی**
**شێوەیی ڕەفتاری‌یە**
**هەرکەسێ نادانە، غـــەرقی خێرو**
**خۆشی‌و نیعمەتە**
**پیاوی دانا جۆگەلەی خوێن وا لە**
**چاوی جاری‌یە دەهری دوون نیشی**
**هەموو عەکسە میسالــی دیوودەد**
**یاری ئەغیارەو ئەوەی، ئەغیارە دایم**
**یاری‌یە**

شاعیر خۆی‌و کێوڵی ، خۆی‌و باری
چەوتی ژیان بە هاوسەر دادەنێ :

**زەمانە ، ناگرێتەوە هەرگیز گرێی**
**بەختم بەکەس**
**دەستی حەق ئـــەمڕوشتەیــــەی**
**یەکسەر گرێچن کردووە**
**کەس لە جەمەی زیــوو زێڕ خێری**
**نەدیووە ، چاوەکەم**
**زۆر دەسی پاکو بــە نوێژی پیسو**
**چڵکن کردووە**

ئەو کەمالی‌یەی ووتویەتی :

**ئەهلی عیرفان بێشكو شوبهە بەگیان**
**سەودای ئەکەن**
**تێ . بگەن گەروا ( کەمالی ) شیعری**
**شیرینی هەیە .**

**ئەو کەمالی‌یە ، هەر بە شیعرە شیرینەکانی‌و بە ووشەی شیرین‌و ڕۆشن ئاشکرا فەلسەفەی وژیانی خۆیمان تێ‌دەگەیێنێ**

**ئەگەر مەردی لە دنیادا سەبەبکارو قەلەندەر بە**
**ڕەفیقی ساقی‌ی سادەو حەریفی جام‌و ساغیر بە**
**وەکو زاهید خەمی جەننەت مەخۆ ئاسوودە خاتر بە**
**بە تەقدیری ئەزەل رازی بەبێ پەروا لە مەحشەر بە**
**هەژاری‌و بێ‌نەوایی شاهی‌یە وەك خواجە بۆ پارە**
**مەبە ریسوایی دنیاو عاقیبەت بێ پوول‌و بێ زەر بە**
**کەسێ مەردە کە ئازاری دلی خەلکی نەدا هەرگیز**
**کە جەلبی قەلبی مەردوم کەی ، برۆ سەردارو سەروەر بە**
**ئەگەر عاقل بێ عیلم‌و مەعریفەت تەحسیل ئەکەی ، وەزنێ**
**کەشێ‌بێت‌و جاهیلی عەودالی نەهبی فاترو کەر بە**

کەمالی بەم شێوە سادەیەو بە ووشەی شاعیرانەو هەر بەو چەشنەی خۆی مەبەستی پێ دەردەبری ، پابەندیی خۆی بە خەلکەوە ، بە میللەتەوە ، بە کاری چاکەوە ، بەو کۆمەلانەی خەلکەوە کە شیعری بۆ نووسین ، دەردەخست پیاوی چاك ، لای شاعیر ئەوەیە کە لەگەل خەلکدایەو بۆ سودوو خێرو خۆشیان هەول ئەداو سەردارو سەروەری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە لەگەل خێرو خۆشی‌ی خەلکدا بێت .

هەر ئەم دێڕانە لە لایەکی ترەوە کەمالی دەخاتە ڕیزی شاعیرانی زانست پەروەر یا پەیڕەوی ڕۆشن بیری‌یەوە ، کە دیمەنی تری ئەو پەیڕەوە لە شیعری کەمالیدا زۆرە . کەمالی وەك لە زۆر شوێندا باسی عیلم‌و مەعریفەت‌و زانست دەکات‌و یەکسەر ستایشیان دەکات ، لە هەندێك شوێندا شێوەی ڕەخنەگرتن‌و تەوس دەگرێت‌و هەر ئەو مەبەستە بەو چەشنە دەر دەبڕێت کە لە شیعری بێکەسدا بەناو بانگە .

کەمالی‌یە ووتوویەتی :

**دەخیلم لافی عەقل‌و مەعریفەت قەت لێ‌نەدەی ئامان**
**زەمانە عاقل‌و دانا کوژە خۆت شێت‌و شەیداکە**

**ئەو کەمالی‌یەی بەم شێوەی تەوسەوە ستایشی زانین‌و عەقلی کردووە ، زۆر شانازیی بە توانای بەهرەی مرۆڤ‌و مرۆڤی هونەروەرە کردووەو پشتی کردۆتە ڕەوالەت‌و دیمەنی پڕ لە ساختەی بەرزبوونەوەو ووتوویەتی :**

**جەوهەری زاتیت کە بوو بام مەسنەدت بالا نەبێ**
**کەوکەبی بەختت لە بورجی عیززەتا پەیدا نەبێ**
**تیشکی عیرفانت بەسە بۆ کەشفی هەورازو نشێو**
**چاوی دل بینابوو بام چاوی سەرت بینا نەبێ**
**لای ئەوەی دانابێ فەرقی گولشەن‌و گولخەن نی‌یە**
**خۆ جەهەننەم حازرە ، گەر حەننەتولمەئوا نەبێ**
**عیززەت‌و زیللەت هەموو چەن ڕۆژە خۆ ناکەن دەوام**
**بەردی ڕەق زۆرە دەبا تۆ دۆشەکت غارا نەلێ**
**هەروەکو یوسف (کەمالی) تۆ بچۆ ناو بیرەوە**
**چی ئەبێ بام مەسکەنت بالا وەکو عیسا نەبێ**

کەمالی‌ی قەلەندەر مەشرەب ، قەلەندەرانە ژیاو هەر ئەوەشە بە ڕێبازی پیاوی دانا زانیووەو ووتوویەتی :

**پیاوی دانا لەززەتی دنیای نی‌یە خوا ڕۆژی خۆی**
**هەر نسیبی تاقە نانێك‌و قومێ دۆ کردووە**

ئەو شاعیرە ، دیارە دەبێ بە چاوی فەیلەسوفێکی نارازی‌یەوە بڕوانێتە هەموو دیمەنێکی ژیانی پڕ لە ناکۆکی‌ی ئەو ڕۆژەی کۆمەلەکەی خۆیەوەو بلێ :

**زەمانە سەیرە هەروا بێ‌تەئەمول دێت‌و دەڕوا خەلك**
**بە ووردی گەر تەماشاکەی عەجایەب سینەمایێکە**

کەمالی ، لە هەموو دیمەنی ناقۆلاو پڕ لە ناکۆکی‌ی ژیان نارازی بوو ، ژیانی سەختی خۆی وای لێ دەکات کە هێندەی‌تر قینی هەلسێ‌و بلێ :

**لە بەر پێری سەرو دەستم ئەلەرزێ تۆ تەماشاکە**
**فەلەك پێکی شەرابی ناب ئەداتە دەستم ئێستاکە**
**هەموو مەستی عەرەق بوون خەلکی جاران سەیر ئەکەم ئەمڕۆ .**
**بە جاری گیژی نەشئەی بەنگ‌و ئەفیوون‌و تریاکە**

هەر لەبەر ئەمەش بوو بەو شێوە سیلبی‌یەی بێکەس نارەزایی دەربری‌و هەر لە کوڕی ئەم جیهان بینینەدا شاعیر بە ووردی سەیری ژیانی دەکات‌و چاوی بە هەموو ئەو شیعرانەدا دەگێرێتەوە شاعیرانی

فەیلەسووفی ڕۆژهەڵات دەربارەی ژیان ووتوویانەو ئەم چەند وێنەیەی لێك دەداتو دەڵێت :

**ئاشنایی قەت لەگەڵ ئەم دەهرەدا پەیدا نەکەی**
**نەتکوژی ئەم پیرەزاڵە ، شێتەکاری وا نەکەی**
**ئاســـمان ئەتنێتە ســـەر تەختی شەهنشاهی بەڵام**
**ئاخری ئەتخا ، ملت ئەشکێنێ پێی بڕوا نەکەی**
**تۆ بە ڕووتی هاتی‌یـــە دنیاو بـــە ڕووتیش هەر ئەڕۆی**
**بۆ تەماع ماڵێ دنیا کاکە خۆت ڕیسوا نەکەی**

هەر لەم مانایەدا لە شوێنێکی تردا دەڵێت :

**تو خوا وازبێنە با چەرخی فـــەلەك هەر دەوری وا ژوون بێ**
**کە چونکە دوونە خۆی ، با پشتیوانی مەردومی دوون بێ**
**لەبەر بێ عەقلی‌یـــە مەغرووی وا ئاغا بە ماڵو جاه**
**بەخاکا ڕۆئەچێ گەر سەروەتت وەك گەنجی قاروون بێ**
**لە سایەی عاشقی شەیداوە ناوبانگ دەرئەکا مەعشووق**
**ئەگەر عەقلی ببێ لـــەیلا ئەبـــێ مەمنوونی مەجنوون بێ**
**هەموو شیعرێکی بەرجەستەی وەکو باڵایی دلداره**
**(کەمالی) لایقە شیعرت ڕەدیفـــی قەددی مەوزوون بی**

کەمالی لێرەدا لە قووڵایی دلـــەوە هەستێکی بەرزمان بو دەردەخات . هەستی شاعێرێك کـــە نرخـــی خۆشەویستی‌ی لا لـــە هەمووشت بەرزتر بێت ، نرخـــی ئادەمیزادی لابێو ئادەمیزادیش لای ئەو بـــە خۆشەویستی‌و پاکی‌یەوە نرخـــی دەردەکەوێت .

کەمالی هەمـــوو پوولو پارەو سەرمایەی جیهان ، بەرامبەر بـــە خۆشەویستی بە هیـــچ دەزانێو خۆشەویستی بەوانە ناگۆڕێتەوە . خۆشەویستیش بەشێکە لە هەستی ئادەمیزادو بە نرخترین بایەخە کـــە قـــەوارەی مرۆڤێتی‌ی ئادەمیزادی کردبێت بە بەنرخترین سەرمایـــەی ئەم جیهانە .

کەمالی هەر لەم فەلسەفەیەوە دەست پێ‌دەکاتەوە، بەڵام ئەمجارەش هەر وەك لـــە باسی زانســـتو هوشیاری‌یا خامەی تەوس‌و گاڵتە پێکردنـــی گـــرت بەدەســـتەوە ، ئەمجارەش هەر لـــەسەر ئـــەو پەیڕەوە باسی سەرمایەیەکی تـــر دەکات ، ئەو ســـەرمایەیـــەی لای هەندێك لە هەمووشت ، تەنانەت لە مرۆڤیـــش بـــە نرخترە . ئـــەو سەرمایەی کۆمەڵ دەکات بە دوو بەشەوە ، کۆمەڵێك ئەوانەن کـــە شاعیر پێ‌یان دەڵێت :

**هێندێ خاوەنی دوو ســـەد دێو قەیسەری‌و باغە کەچی**
**هەر دلی پڕ داغە ، تەختو تاجی شاهانەی ئەوێ**

کۆمەڵەکەی تریش ئەوانەن کە شاعیر پێ‌یان دەڵێت :

**هێندێ ناتێکو قومێ دوێ بێ ئەکا شوکری خوا**
**قانیعەو ڕازی ، ژیانێکی هەژارانەی ئەوێ**

هەڵوێستی شاعیریش لـــەم نێوانەدا هەڵوێستێ فەیلەسووفێکە کە بیەوێ بە ووردی لەم کێشـــەیـــە بکات ، هەڵوێستێ کەسێکە کە باش تێبینی بلێت :

**عەینی هەر وەك سینەمایە بەزمـــی دنیا چاوەکەم**
**سەرسەری (٤) سەیری نەکەی ، بیری حەکیمانەی ئەوێ**
**کەم کەسێ پەیدا ئەبێ مەقسوودی خوا بێو هیچی تر**
**سەیری هەرکەس من ئەکەم ، هەر درهەمو عانەی ئەوێ**

ئەمە دەڵێتو خامەی گاڵتـــە پێکردنو ســـووك کردنو تـــەوس بەدەستەوەو هەروەك بەناو ستایشی نەزانی‌یەوە . نەزانی‌ی سووك دەکرد، هەروەها بـــەناوی ستایشی پارەوە ئەو سەرمایەیە ڕیسوا دەکات کـــە پارەیەو لای دەســـتەی یەکەمـــی کۆمەڵ کە باسی کردن،لە بەنرخترین ســـەرمایەی ئەم‌جیهانە . لە مرۆڤ، لە ئادەمیزاد بە نرخترە . لەوڕێگەی خواپەرستی‌یە بە نرخترە کە شاعیر بە ڕێگەی چاکـــە کردن پاکـــی‌ی دەزانێت .

دەروون پـــڕ لـــە گاڵتـــە پێکردنەوە ، خامە دەگرێـــت بـــە دەستەوەو دەنووسێت :

**پارە توخوا پێم بلێ تو چیت ؟ کە مایەی ژینمی**
**باعیسی هێزی هەناوو لاشەکەی بێ تینمی**
**تۆ ئەبی هیچ کەس منی ناوێ ، چ بێگانە ، چ خوێش**
**جا کەوابـــێ تۆ کەس‌و کارو برای شیرینمی**
**سەد هەزار عەیبم ببێ‌تۆدای‌ئەپۆشی یەك کەرەت**
**باعیسی سەربەوزی‌و سەرمایەیـــی تەمکینمی**
**تۆم ببی ئەچمە حەجو هێند خێـــر ئەکەم بچمە بەهەشت**
**ڕابەری دلسۆزی ڕێگەی ڕاســـتی دنیاو دینمی**
**گەر ئەخۆش‌بم ، ئەمبەیە لەنـــدەن تەداویم زوو ئەکەی**

**مەلحەمو دەرمانی زامی جەرگەکەی غەمگینەی**
**تۆم نەبێ چۆن یار لە ماڵ بۆم دێنەدەر بێترس‌و خۆف**
**تۆی کە مەحبووبەی عەزیزو یارەکەی دێرینەی**

شاعیر بە تەوسەوە ستایشی ئەو بتە دەکات کە ئادەمیزاد خۆی دروستی دەکات‌و دوایی دەکەوێتە پەرستنی ، کە ئەویش پارەیە . چونکە وەك پەندی پێشینانی کورد دەڵێ : پارەچلکی دەستە . دیارە لای شاعیریش هەروایە . بەلام شاعیر کە بەم جۆرە بە تەوسەوە ئەو ستایشەی پارە دەکات ، گاڵتە بە کۆمەڵ‌و رژێمیکیش دەکات کە هەموو بایەخ‌و نرخ بۆ دانانێکی هەر بە پارەبێت . هەرچەندە شاعیر دان بەوەدا دەنێت کە لەو کۆمەڵەدا پارە هۆی گەورەیی‌و سەربەرزی‌و نرخی ئادەمیزادە ، چ لای بێگانە بێت‌و چ لای خویش‌و هۆی بەهەشت کرین‌و لەش ساغی‌و شادمانی‌و دڵشادی‌و بەختیاری‌یە ، لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر سەربەرزانەو سەرسەختانە ، سەر بۆ ئەم چەشنە بایەخ‌و پێوانە نارەوایە دانانەوێنێت‌و لەگەڵ هەموو هەژارێکی زەحمەتکێش‌و رەنجکێشدا دەڵێت .

**نانی رەنجی شان ئەخۆم ، وەك تۆ هەوای جاهم نی‌یە**
**ترسی عەزاب‌و خۆف بیمی حەزرەتی شاهم نی‌یە**
**بۆ فەلەك ناکەم تەنەزول ، چونکە زۆر دوون پەروەرە**
**ئیحتیاجی شەوقی رۆژو پرتەوی ماهم نی‌یە**

هەموو ئەو سەرمایەیە ، لای کەمالی بێ‌نرخەو هەمووی شتێکی بێ‌مانەوەیە :

**کەقەروتندا هەموو یەك لەحزەیە تاەی ، نی‌یە**
**(کەمالی) گەر پلاوی سەدری یاخو هەرزن بێ**

نرخی گەورەو ئەو بایەخەی هەتا هەتایە دەمێنێتەوە ، ئەوە ئەو بایەخەیە کە لە دەروونی ئادەمیزادی بەنرخەوە هەڵدەقوڵی ، ئەوە خۆشەویستی‌یە :

**شوکور یار ئێزنی‌دا شەو بچمە بەردەرگانەکەی بۆپاس**
**ئیتر بۆ چیمە روتبەی شەهریاری‌و تەختی قاجاری**

شاعیر خۆشەویستی کە دیمەنێکی نرخی بەرزی مرۆڤ‌و هەستی یەتی بە شتێك دەزانێت کە لە ناوچوونی نی‌یە ، بۆیە هەر دەربەستی ئەوەو هیچی تر :

**لە دنیادا هەمووشت قابیلی تەغیرو گۆڕرانە**
**بە تەنیا حوسنی تۆو عەشقی منە ئەیدیوە تەغییرێ**

ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە لە ژیان‌و سروشت‌و کۆمەڵ‌و ئەم پەیڕەوەی شیعر وتن‌و ئەم هەستە قووڵەی ئادەمیزاد . ئەمانە هەمووی (کەمالی) ی شاعیر لە کۆڕی ژیان‌و ئەدەب‌و هەست دەربڕیندا دەبەستێت بەو پەیڕەوە ئینسانی‌یەی ئەدەبی رۆژهەلات‌و کوردەوەو بەو شاعیرە گەورانەوە کە چەند جار خۆی بە دێڕی شیعرەکانی خۆی بەست بەوانەوەو لە رێڕەوی هەست‌و بیردا خۆی بە قوتابی‌یەکی سەر بەوان دانا .

حافزی شیرازی‌و سالمی ساحێبقران ، لە کۆڕی شیعری رۆژهەلات‌و کوردی‌دا دوو رابەری کەمالی بوون‌و لە چەند شوێنێدا ئەمەی بۆ ژیانی خۆی‌و بۆ مێژووی ئەدەبیاتی کوردی تۆمار کردووەو هەر لەو کۆڕی تەماشا کردنەی ژیان‌و کۆمەڵ‌و بایەخەشدا لەگەڵ حافزی شیرازی‌و سالمدا دەڵێت :

**(کەمالی) بەم قسانە خەلك ئەکەن هەرچەندە گاڵتەو گەپ**
**قبوولی‌کا ئەگەر دلداری دل ، نازاری شیرین لەب**
**بە پاسی دەرگەی رازیم لە باتی روتبەو مەنسەب**
**ویسالی دولبەرە (سالم) موقەددەمتر لە هەر مەتلەب**
**متی ماتلق من تهوی ، دع الدنیا و اهملها**

**پەراوێزێك بۆ شیعری دلداری کەمالی :**

**غەزالەی دەشتی چین وەحشن لەگەڵ کەس ناگرن ئولفەت**
**فیدای کارئاسکەکەی سەحرای هەلەبجەم من کە سل ناکا**

لە مەیدانی غەزەل‌و شیعری دلداریدا ، یا لە مەیدانی سووچ‌و مەودای شیعری کلاسیکی‌ی کوردیدا ، رەنگە ئەم دێرە بکرێت بە کەرەسەی زۆر لێکدانەوە ، ماوەی بەرینی تازە دۆزینەوەو .. ئیبتکار .. ی ناو میحرابی بەلاغەتی پێ بەخشرێت ، یا لەو هەموو ئاسۆ برین‌و لاسایی تەشبیهی رۆژهەلاتەدا نیشانەی ریالیستی‌و بە خاکی نیشتمانەوە ئالۆدە بوونی بدرێتی . بەلام من لێرەدا هەر لە سووچی چێژ لە شیعر وەرگرتنەوە ، کە ناوی مەلی کەمال باپیر دێت ، پێش هەموو شتێك ئەم دێرەم دێتەوە یاد ، رەنگە هەر لە بەر ئەو هۆیانە بێت، یا لەبەر جوانی‌ی دێرەکە بێت ، یا بێ‌هەست بە خۆکردن ئەنجامی لە

زووەوە . بە دەنگێکی خۆش بیستنی ئەو دێڕە بە گۆرانی کراوە بێت . بە هەموو بارێکدا ئەم دێڕەوە بە دلنیاییەوە بڕیاری تێکەڵ بوونی سۆزو تەقلید بەسەر شیعری دلدارییی کەمالیدا دەدەین .

**(کەمالی) دڵ برینداری دەمی ی شمشێری ئەبرۆتە**
**بە غەمزەت سا لە سینەی بەس بدە نەشتەر خودا حافیز**

ئەم جۆرە دێڕو هۆنراوەیەش دەچنە ڕیزی ئەو شیعرانەوە کە فیداکاریو ڕاستگۆیی دلدار دەر دەبڕن .

تەماشاکە (کەمالی) من نی یە
فەرقم لەگەڵ فەرهاد
وەکو ئەو بێستوونی کەند، منیش وا
قەلعی شاهۆم کرد

شاعیر زۆر لەسەر ئەوە سوورە کە هاتە سەر باسی دلداری کۆتایی بە وێنەی فیداکاری بێنێتەوە ، یا فیداکاری بە بناغەیەکی پێویستی دلداری بزانێت :

**بەسەر دەفتەر (کەمالی) کرد قبوول ئەو دولبەرە ئەمڕۆ**
**لە ڕیزی گیان فیدانا کە هاتو ئیمتیحانی کرد**

ئەگەر کەمالی لە هەموو شیعرەکانیدا پشتی بە ئەدەبیاتی کلاسیکیی ڕۆژهەلاتو کوردەوە بەستبێت ئەو ئەدەبیاتەسەرچاوەی وشەو وێنەو دیمەنی جوانی کاریو بەلاغەتی بووبن ، ئەوا لە گەرمەی سۆزی دلداریدا ڕوو دەکاتە کانیاوی فۆلکلۆری کوردیو گڕی تینی دلداریی بە ئاوی ساردی دەشکێنێ:

**شەهیدی تیری برژانگی کەژەڵ چاوێکی بێ‌دینم**
**شەفاعەت خوازمە ڕۆژی قیامەت بەرگی خوێنینم**

ئەگەر هەر وشەو داڕشتن وێنەیە ببرێتەوە سەر سەرچاوەیەکی بەلاغەت ، ئەوا ئەم دێڕە دەبرێتەوە سەر دێڕە گۆرانی‌یەکی فۆلکلور کەدەڵێت :

بنووسن لەسەر کێلی مەزارم
شەهیدی عەشقم ، مەدەن ئازارم

کەمالی لەم چەشنە دێناتەی بەو سەرچاوەیەوە دەبەسترێن زۆر دووبارە دەکاتەوە :

**بە خوێنی جەرگەکەم دەستی کە ڕەنگین کرد نیگار فەرمووی**
**(کەمالی) سەیری کە چەن جوانە سەرپەنجەی نیگارینم**

یا هەر ئەو وێنەیە دادەشکێنێتەوەو تێکی دەشێلێ‌و سەر لەنوێ دایدەڕێژێتەوە :

بە پوولێ نامەوێ مەحبووبەیەك دڵ
ساف‌و خۆش ڕووبێ
فیدای ئەو دولبەرەم من حیلەبازو
توندو جادوو بێ
دەخیلم وێنەگر کاتێ ئەکێشی شکلی
ئەو شۆخە
کەمێ وریابە شێوەی چاوی مەستی
باخەوالووبێ
ئەگاتە چەرخی حەوتەم تای
تەرازووی زوو لەبەر سوولی لە
دەعوای جوانی‌یا هەرکەس لەگەڵتا
هاوتەرازوو بێ
بەسە بێ لوتفی ئەی بێ‌ڕەحم‌و
مرووەت خۆشت ئەیزانی
محالە گیان فیدایێکی وەکو من
ڕاستگۆت بوو بێ
شوکور خەندەی دەمی زیندووی ئەکا
دووبارە پاش مەرگی
ئەگەر ئەو نازەنینە بێت‌و بۆ
سەر گۆڕی مردووبێ
بە کفنی ئاڵەوە شانازی‌یە کاری لە
مەحشەردا
(کەمالی) هەرکەسێ وەك تۆ
شەهیدی تیفی ئەبرۆ تی

دیسان لێکدانی وێنەی فۆلکلۆرو سۆز شیعری مەحوی لە چەشنە داڕشتنەوەیەدا دەبینین کە دەڵێت :

تیرەبارانی کە کردم یار بە برژانگی
ووتی
ئەم شەهیدی عەشقە بۆ مەحشەر
جلی خوێنین ئەبا

پێوەندیی کەمالی بە فۆلکلۆرەوە ، لە زۆر دێڕو چمکی تردا دەبینین :

**غەم وەفادارە لە مرە یەك لەحزە جیا نابێتەوە**
**یاری تەنگانەم غەمە هەر بەو دڵی خۆم شاد ئەکەم**

ئەم وێنەی غەمە هەر بە تەواوی بەشێکە لە شیعرو گۆرانی‌ی فۆلکلۆری کوردی‌و هەر لەوێوە وەرگیراوەو (٥) لەوێوە چۆتە ناو شیعری زۆر لە شاعیرە کۆنەکانمانەوە ژیانی پرستەم‌و ماتەم ئازاوی چەندین سەدەی گەل، گەلێك وێنەی دەربارەی غەم‌و خەفەت لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا دروست کردووە .

هەر (کەمالی)یشە ووتوویەتی:

هێندە گریاوم لە دووریت ،
خۆشەویستی‌ی میری حوسن
دەشت‌و سارای شارەزوو ، ئێستا
لە دەریای نیل ئەکا

**کەمالی‌و نیشتمان‌و شێخ مەحموودی نەمر :**

کەمالی بوو ووتی :

پەیڕەوی (حەمدی) ئەکەم دایم
(کەمالی) بۆیەوا
ویردی خاس‌و عامە ئەشعاری
تەرەب ئەفزایی من

دیارە کەمالی لەکۆڕی شیعری کوردیدا خۆی بە پەیڕەو کەری حەمدی دەزانێ‌و خۆی بەشاعیرێك

دەزانێ کە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا لە شاعیرانی ئەو پەڕەوە دابنرێت کە (حەمدی) شاعێرێکی گەورەیەتی . واتە ـ ئەو شاعیرانەی لە سەدەی بیستەمدا لەسەر پەیڕەوی قوتابخانە کلاسیکی‌یەکەی نالی‌و سالم‌و کوردی دەڕۆن‌و هەندێ مەبەستی تازەی ئەم سەدەیەش دەخەنە چوار چێوەی هەڵبەستیانەوە. بەڵام هەر ئەمەنی‌یە کە کەمالی‌و حەمدی کۆ بکاتەوە ، بەڵکو لە مێژووی ژیانیانداو لە مێژووی ناوچەکەیاندا شتێکی هاوبەش هەیە کە لەگەڵ یەکدا کۆیان دەکاتەوە ، بەڵام شیعرەکانی ئەم مەبەسەیان لەیەك نزیك ناخاتەوە . واتە ، ئەم هاوبەشی‌یە لە ژیانی هەردوو شاعیرو لە ژیانی ناوچەکەیاندا وەك یەك لە شیعری هەردووکیانا شەوقی نەداوەتەوە.. ئەوەش سالآنی شۆڕشی کوردە بە ڕابەریی شێخ مەحموودی نەمرو ڕۆڵ‌و هەڵسو کەوتی هەردوو شاعیرە لەو سالآنەدا حوکمداری مەلیکی شیخی نەمردا .

چ حەمدی‌و چ کە مالی هەردوو کیان خەڵکی شاری سلیمانین‌و لە سەردەمی شێخی نەمردا هەر ئەوە نی‌یە لە سلیمانی بوون ، بەڵکو بە خوێندەواریش ناسرابوون‌و نزیکی شێخیش بوون . تەنانەت دەتوانین بڵێین کەمالی نزیکتری شێخ بووە. ماوەیەك کاتبی بووەو بە نوماینەدەی ڕەسمی ناردوویەتە ئێران‌و لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی وولآتدا یا نووسەر یا سەر نووسەبریشی کردووە . پاشان کەمالی وەك (حەمدی) و هەندێك خوێندەواری تری ئەو دەورە لەبەر هەندێك هۆ کە دیارن‌و مێژووی تازەمان تۆماری کردوون ، لە شێخ زویر دەبن ، یا ئەو لێیان زوێردەبێ ئەم بەسەرهاتانە بە چاك‌و چەوتی‌یەوە لە شیعری حەمدیداوەك ئاوێنەیەك دیارە (٦) .

ئەم ئاوێنەیەی پێوەندیی شاعیر خۆی لەگەڵ ئەو ڕۆژانەداو تۆمار کردنی دیمەن‌و بەسەرهاتی ئەو ڕۆژانە لە بەرچاوی شاعیر لە شیعری کەمالیدا نابینرێت کە دەڵێن کەمالی‌و شیعری مەبەسمان زیاتر دوو دیوانە چاپکراوەکەیەتی (٧) . واتە ( دیاریی شارەزوور ) و ( باغی‌میر ) . چونکە لەو بارەیەوە شتی ئەوتۆی هەبوایە دەبوو لەو دیوانانەدا بێت . ئەگەر بڵێی کەمالی خۆی لە باسی ڕۆژانی شێخ بە دوور گرتووە ، ڕەنگە بریارەکەمان زۆر ڕاست دەرنەچێت . چونکە لە **دیوانەکەیدا دوو پارچە هۆنراوەی تێدایە کە بۆ شێخی نەمر ووتراوەو جۆرە هەستێکی ئەوەیان تێدا بەدی دەکرێ** کە دیمەنی ئەو بەسەرهاتانەو پێوەندیی شاعیر بەوەوە بگێڕنەوە . بەڵام ئەو سۆزو ڕاست‌و ڕەوانی‌یەیان تێدا نی‌یە کە لە شیعری حەمدیدا دەبینرێن هەردوو پارچە شیعرەکەش زۆرباش حوکمرانی‌ی شێخ نووسراوون . یەکێکیان کاتێك نووسراوە ، کە شێخ لە بەغدا دەست بەسەر دەبێت (٨) .

کەمالی دەڵێت :

ئەوا ئەی شەمعی دین ! پەروانەکەی دەوری چراکەت هات
غەریبو دەربەدەر مەجنوونی بێ بەرگ‌و نەواکەت هات
بە دەورەی ڕووی وەکو گوڵتا هەتاکو نەغمە خوانی کا
لە کوردستانەوە وا بولبولی داستان سەراکەت هات
لە مەدحی تۆ هەتا هەڵبەستێ هەڵبەستی بە سۆزو تەڕ
فیداتم ، شاعیری شیرین کە لامەو خۆش ئەداکەت هات
بە شەو بۆ پاسی دەرکی کۆشکەکەت چاکە قبوولی کە
کەمالە پیرەکەی پیران‌و کەلبی باوەفاکەت هات
دەخیلم ! تو خودا نۆرەی وەفاتە ، بەس‌یە بێ لوتفی
بە دەردو ئێشەوە زاماری پێکانی جەفاکەت هات
بە بەندی‌و زەجرو لێدانت نەبوو دلگیر ، ئەوا دیسان
بە کۆڵێ سیدقەوە دووچاری ئەنواعی بەلآکەت هات
ڕیا ناکەم ئەزانم شاهیدە ئاوێنەیی قەلبت
فیدایی بەندە بەندەکەت ، یەعنی (کەمالی)ی با وەفاکەت هات

کەواتە : بەندی‌و زەجرو لێدانی شێخی نەمر ، شاعیری دلگیر نەکردووەو هەر خۆی بە خاوەنی ( کۆڵی سیدق ) و وەفاداری ئەو سەروەرە دەزانێ . وەفاداریش لە ڕادەیەکدا کە هێندە خۆی دەهێنێتە خوارێ کە خۆی بەسەگی بەوەفای ئەو سەردارە بزانێت ..

کەواتە : ئەو هەموو ئازارە وا لە کەمالی ناکات کە نەك هەجوو ، بەڵکو ڕەخنەش ناو تەنانەت گلەیی‌و تۆراوی پیشاندانیش بخاتە چوارچێوەی هەڵبەستەوە . لە کاتێکدا کە حەمدی ئەو ڕێگەیەی گرتەبەر . هونەریش لەوەدایە کە

ئەمالی کاتێ بەم زمانە ڕووی دەکاتە شێخ کە ئەو دەسبەسەرەو شاعیر ئازادە .

ئایا بۆچ دەبێ ئەمە ئاوێنەی ڕۆژانی حوکمرانی شێخ نەبێت لە شیعری کەمالیدا ڕەنگە وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەبێت کە کەمالی لێرەدا تەنیا لە کونجیلەوە هەستو پێوەندیی خۆی پیشان دەداتو لەوە ناچێت کە مەسەلەکە بخاتە چوارچێوەی گشتی‌یەوە . کە ئەوە لە شیعری حەمدیدا زۆر ئاشکرا دیارە . تەنانەت کاتێك کە دێتە سەر ستایشی شێخی ئەمریش هەر وەك گەورەیەکی خۆیو پیاوێکی گەورەو بەرێز باسی دەکات ، بێ ئەوەی کە لە هەڵبەستەکەدا ئەوە دیار بێت کە باسی سەردارێکی نەتەوەکەی دەکات تەنانەت بوونکەی ناو بردنو ستایشی شێخی ئەوەیە کە پێی دەڵێت : « شەمعی دین » . . ، خۆشی دەکات بە « پەروانە »ی .

هەرچەندە لە ڕووی فۆرمی شیعرەوە ، دەتوانین ئەوە بڵێین کە کەمالی لێرەشدا هەر ئەو ووشەو کەرەسانە بەکار دەهێنێت کە لە شیعری دلداریو ئەڤین‌دا لە بەردەستیدا بوونو **ئەمەش بۆ لێکۆلینەوەی شیعری کەمالی شتێکی پرمانایە** ، بەڵام وەك یەکێك کە نەیەوێ باسەکە بەرێتە سنووری مەسەلەی نیشتمانی‌یەوە، یا نەیەوێ لێرەدا خۆی بەرێتە کۆڕی شیعری نیشتمانی‌یەوە ، هەستی خۆی بەم جۆرە بەرامبەر بە شێخی ئەمرو بەرامبەر بە پێوەندی‌یەکەی خۆی دەردەبڕێ .

کەمالی لە پارچەی دووەمیشدا لە دیوانی (باغی میر) دایەو بۆ کۆچی شێخی ئەمر نووسراوە ، هەر لەسەر ئەو پەیڕەوە دەڕوات . با لە چەند دێڕێکدا لابەلا باسەکەی بەرەو مەسەلەی نیشتمانیش بردبێت ، بەڵام هەر ئەوەنی‌یە کە نە خۆی ڕێكو ڕەوان بچێتە ئەو کۆڕەوەو نە ئەم باسەش ببەستێ بەو مەسەلەیەوە .

ئەمساڵ لە پرهات ڕەشەبای خەزان
لە بەدبەختی‌ی من
هەڵیکەند ڕیشەی گوڵی کوردستان
لە بێخو لە بن
کام گوڵ؟ ئەو گوڵەی ئەحمەدی کاکی
قوتبی ڕەبانی
ناشتی‌و ئاوی‌دا بە دەستی پاکی
بۆ کامەرانی
سەربەست بوو ، دلێر ، ڕەشیدە
چالاك
واریعو بە دین
شێخ مەحموود ، یە عنی حەفیدا
زادەی پاك
ئەولادی حسەین
داخت بەجەرگی هەموو کوردا نا
کاتێ کۆچت کرد
شین واوەیلا بە جارێ هەڵسا
لە ناو گەلی کورد

هەرچەندە شاعیر لە هەندێك دێڕدا سۆزێکی بەتین لە ناخی دڵیەوە بۆ کۆچی شێخ دەردەبڕێو زیاتر دەیەوێ ئەو سەردارە ببەستێ بە مەسەلەی نیشتمانی‌یەوە ، بەڵام هێشتا پارچەکە بە تەواوی ناچێتە خانەی شیعری نیشتمانی یەوە . بەڵام ئەمە ڕێبازی شاعیرە ، یا هەر ڕێبازی ئەو شاعیرانەیە کە لە مەشخەڵ هەڵگرتنو فۆرمی دەربڕینی شیعری کلاسیکی بە کار هێنانیدا بەردەوام بوون (٥٩) .

ناتوانین بڵێین کەمالی شیعری نیشتمانی‌ی نی‌یە ، بەڵکو لە تاكو چوارینو هەندێك پارچە شیعردا سۆزێکی قووڵی نیشتمانپەروەری قوڵپ دەدات (١٠) . ئەم بەرهەمانەی بەڵگەی ئەوەن کەکەمالی بە کەمی‌ی شیعری نیشتمانپەروەری ناکرێت بە شاعیرێك کە هەستی نیشتمانپەروەری نەبێ . بەڵکو هەر لەبەر ئەوەیە کە کەرەسەی شیعری کەمالی لە ئەدەبیاتی کلاسیکی فارسی‌و کوردی‌یەوە وەرگیراوەو ئەو کەرەسەیە ، یارێکتر ئەوەیە بڵێین ئەو فۆرمەی هونەر بە زەحمەت بۆ ناوەڕۆکی تازە دەست دەدات . لەوەش دەچی کە کەمالی وەك شاعیرانی ڕۆمانتیكو ریالیستی ئەم سەردەمە ، کەرەسەو فۆرمی تازەی بۆ دروست نەکرابێ تا ناوەرۆکی تازەی پێ دەربڕێ . لەبەر ئەوە دەبینین کە ناوەڕۆك باسی غەزەلو دلداری‌و ئەڤین بێت ، ئەوا فۆرم ووشەو کەرەسەکەی کەمالی پڕ بە پێستی ئەو ناوەڕۆکەیە . بەڵام کە دێتە سەر ناوەڕۆكو باسی تازە ئەوا ناپێکێ .

دەبینین هەر لە پارچەیەکدا کە بۆ نیشتماپەروەری تەرخانکراوە (١١) هەندێك کەرەسەی ناوەرۆكو فۆرمە کلاسیلی‌یەکەی هێناوەو خستویەتە خزمەتی مەبەسی تازەیەوە ، وەك : ( بە بادەی عەشقی ئەو نەبێ سەرخوش ) یا ( دائیم پڕ نەبێ لە نەشئەو خرۆش ) . یا :

ئەو دڵە یاخوا بەر خەنجەر کەوێ
بەر پە یکانی تیر ، بەر نەشتەر کەوێ

یا ووشەی ( نامەحرەمو زەهری‌مار ) . . . هتد . بەڵام چونکە نوربەی بیرو ووشەکانی تازەن ، لەبەر ئەوە ئەو پتەوی‌و سۆزەی

شیعرەکانی تری کەمالی یان تێدا نی‌یە . یاباسێکی سەربەخۆشی تێدا ببینرێت .

بەلگەیەکی تری ئەم بیرەمان، ( ئەوەی کە کەمالی پێی لە کۆڕی شیعری کلاسیکیدا داکوتاوەو نەیوویستووە بجوولێت ) : ئەوەیە کە کەمالی لە دەوری ( شێخ نووری‌و گۆران‌و پیرەمێرددا ) ژیاوەو لەگەڵ ئەوانیشدا هەڵساوەو دانیشتووەو زۆر پێوەندیی ئەدەبیشی هەبووە کە بە یەکی‌یەوە بەستبن، کەچی شیعری کەمالی تادوایی لەسەر کێشی عەرووز (یا تریك عەرووز)ماوەتەوەو نەچۆتە سەر کێشی پەنجەی کوردی بەلکو هیچ شیعریشی وەك ئەوان بەو کێشە نەووتووە . ئەمە ئەگەر تەئسیری ئەوانیش نەبووایە کە هاودەورو هاوشانی ئەو بوون ، دەبوو شیعری مەولەوی هەنگاوێك بەرەو ئەو مەیدانەی بجوولێنێ‌و چەند پارچەیەك بەو کێشە کۆنەی کوردی بلێت کە بەکێشی نەتەوەیی شیعری کوردی دەزانرێت . بەلام نەبوونی ئەم دیمەنەش هەر ئەوەمان پێ‌ڕادەگەیێنێت . کە کەمالی شاعیرێکی کلاسیکی‌یەو پاشماوەی ئالۆدەیی شاعیرو بیر ڕووناکی کوردە بە هەموو سامانەکەی لەمەوبەری شیعری کوردی‌و فارسی‌یەوە . بۆ ئەم مەبەستەش ، بە تایبەتی بۆ مەبەسی ناتوانایی فۆرمی کۆن لە دەربڕینی بیری تازەدا ، گەلێ بەلگە لە شیعری کەمالیدا دەبینین ، بە تایبەتی شینەکەی (فایەق بێکەس)ی کە لە باڵ هەموو سۆزو دڵ برینداری‌یەکدا ، کە چونکە دەبوو لە باری سەرنجی نیشتمانپەروەری‌یەوە شینی بۆ بکات ، ئەوە دەرنەچووە کە دەبوو ببێت .

تێکرا کەمالی‌ی کەلە شاعیر ئەوەیە کە خۆی جێی خۆی لە کاروانی شیعری کوردیدا دەستنیشان کردبوو ، لە ڕیزی شاعیراندا سەرفرازە ، شاگردی سەرکەوتووی مەحوی‌و شوێن پێ‌گری سالم‌و هاوڕێی نالی‌و حەمدی‌یە .

بە سەرفرازی ژیاو مرد .

(١) لەم نەخشەیەی کەمالیدا سالم دەبێت بەڕابەرو شاعێری یەکەمی ئەدەبیاتی بابان . ئەم ڕایە هەر ڕای ئەو نی‌یە ، بەڵکو لە شیعری گۆرانیشدا شانازی بە سالم‌و شیعری‌یەوە دیارە .
لە زۆر لێکدانەوەدا وا ڕۆیشتووە کە نالی ڕابەرو دامەزرێنەری ئەو قوتابخانە ئەدەبی‌یە بێت . بەلام لای زۆر کەسیش پارسەنگی سالم دەدرێتەوە . ڕەنگە ئەم ڕایە لای هەندێك هەر ڕایەکی مەوزوعی بێت‌و نرخ بە سالم دان بێت‌و لای هەندێك بە ئاسانی لە سالم گەیشتن بێت ، بەلام لای هەندێکی تر شیعری نیشتمانپەروەریی ئاشکرای سالم ئەم جێگەیەی داوەتێ . مانەوەی سالم لە وڵات‌و سەر بە خێزانێکی ناسراوی کۆمەلێتی لای هەندێك جێگەیەکی تایبەتی‌ی بۆ پەیدا کردووە .

(٢) لە شیعرێکی تردا خۆی دەباتەوە سەر سەعدی‌و دەلێت : سەلیسی‌و نیکتە بازیی تۆ ( کەمالی ) شاهیدن ئەمڕۆ کە شاگردی هونەرمەندی جەنابی شێخی شیرازی لە بارەی شیعری کوردی‌و تەئسیری حافزی شیرازی‌یەوە بڕوانە ( دوکتۆر ئەمین عەلی موتابچی . گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات ژمارە ١٦ . )

(٣) کەمالی زۆر ئاشقی بەکارهێنانی ووشەی شەکرو تەشبیە کردنی شتی جوانە بە شەکر . زۆر جار لێوی یار بە قەندو شەکر دەشوبهێنێ ، ڕەنگە هەندێك جار ئەمە لاسایی کردنەوەیەکی کلاسیکی بێت . بەلام کەمالی بەوەوە نەوەستاوە ، بەڵکو لەو شەکرو نەبات‌و قەندی کۆنەوە هاتۆتە سەرباسی شەکرو قەندی میسرو بەلچیکاو . وا ووشەی جوان بە شیرین دادەنێ ، واتە بەووشەیەك بلێ .. شیرین .. ، ئەوە زۆر لای بایەخدارترە لەوەی پێی بلێ «جوان» و لە شیرینیشدا هەر دێتەوە سەر شەکر کەواتە ئەمە هەر لاسایی نی‌یە ، بەڵکو نیشانەی شتێکی تایبەتی‌یە لە ژیان‌و هۆش‌و هونەری کەمالیدا . ڕەنگە ژیانی نەلەندەری‌و هەژاری‌و لە ماڵەوە دانیشتن‌و سەرکز کردن بە دیار قۆری‌یە چاوە سەرچاوەی زۆر ووتنەوەو بەکار هێنانی ئەم تەشبیهە بێت .

(٤) ووشەی : سەرسەری : لێرەداو تێکرا لە کوردیدا بە مانای سەتحی یا لاوەکی بەکار دێت .

(٥) بۆباسی خەم‌و فۆلکلۆری

کوردی،لە کتێبی لێکۆڵینەوەی
ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا بە
درێژی لێی دوواوین .
هەرچەندە وێنەی (خەم)یش
کەرەسەیەکی دێرینی هەموو
شاعیرانی کۆنیشمانە .
(٦) کۆچ کردوو مەلا مەحموودی
حاجی مەلا ڕەسوولی دێلێژە
( مامی نووسەری ئەم ووتارە )
کە لە مەیدانی گەلێک
بیرەوەری‌و تۆماری مێژوویی‌و
شیعر گێڕانەوەدا یەکێك بوو.
لە بلیمەتە ، زمان پاراوەکانی
دەوری خۆی ، یەکێك بوو لە
دۆستە هەرە نزیکەکانی‌شێخی
نەمر ، دەیگێڕایەوە دەی‌ووت :
کاتێك شێخ هاتە بەغداو لەوێ
دەس بەسەر بوو ، ماڵی لە
ئەعزەمیە بوو ، لەگەڵ
حەمدیدا چووینە خزمەتی .
هەریەکەی بە هۆیەکەوە زۆری
ئیحتیرام گرتین ، کۆمەڵی لە
پیاو ماقووڵانی عەرەبی لابوو ،
منی بە کوڕی حاجی مەلا
ڕەسوولی خەلیفەی کاك
ئەحمەد پێشکەش کردو هاتە
سەر حەمدی‌و ئەوەی
ساحیبقران‌و شاعیرێتی‌ی
حەمدی ، دوایی فەرمووی
ئەمە ئەو کەسەیە کە من
حوکمڕان بووم بە شیعر
جوێنی پێدام .
ووتی : حەمدی هاتە جواب‌و
ووتی :
قوربان من تەنقیدم کردووە ،
حەددی جوێن دانم نییە
شێخ فەرمووی : هەرچیت
ووتووە گەردنت ئازاد بێت ، .
برای عەزیزی منی .
بێگومان هەڵوێستی حەمدی
بەرامبەر بە حوکمڕانی شێخ
هەڵوێستی پیاوی مەردە ،
لەسەر کاردا بوو ڕەخنەی
تیژی دەگرت ، کە بنەما بەو
سۆزو دڵسۆزی‌یەوە باسی
دەکات کە لە شیعرەکانیدا
دیارە . هەرچی هەڵویستی
پیاوانی وەك : عەلی کەمال‌و
باپیرو ئەحمەد موختاری
جافو ڕەفیق حیلمی‌یە ،
هەڵویستی پیاوی
نیشتمانپەروەری هەست
بەمەسئوولیەت کەری ئەو
تۆیە ، کە بۆ چاکەی گەل‌و
نیشتمان چاویان لە هەموو
ئازارو باری تایبەتی‌ی
خۆیان پۆشیووەو لە گوڵ
ناسکتریان بە شێخ نەووتووە
(٧) بێجگە لەو دوو کۆمەڵە
چاپکراوە ، دیوانێکی
دەستنووسی کەمالی هەیە کە
کەوتبووە کتێبخانەی حەسەن
فەهمی بەگی جافەوە ، تاك‌و
تەرا شیعری نیشتمانی‌ی هەیە
کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ،
یا بە کارتی جەژنە پیرۆزەو
بەسەر زاری خەڵکەوە بڵاون .
دەربارەی ڕۆژانی شێخی نەمر
چەند دێڕێکی بە نرخی هەیە
لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری (ڕۆژی
نوێ ) ی ساڵی ١٩٦٠ دا
بڵاوکراونەتەوە .
(٨) چەند ساڵێك پێش‌مەرگی
کەمالی ، جەژنێك لەگەڵ
چەند کوڕێکی ئامۆزامدا
چووینە لای ، باسی ( چیم
دی ) ی ئەحمەد خواجەو
ڕۆژانی شێخی نەمر کرا .
داوامان لێکرد ئەویش
یادگاری خۆی بنووسێتەوە .
زۆرتر خۆی لە مەسەلەکە
لائەدا . لای وابوو نابێ ڕەخنە
لە شێخ بگرێت‌و نابێ هەموو
ڕاستی‌یەکیش بە ( لایەنی
گەش‌و کەم‌و کووڕی‌یەوە
نەڵێت ) . دوایی بڕیار وابوو
یەکێك لە ئامۆزاکانم بچێت
دابنیشێت لای‌و چی‌ی ووت
بینووسێتەوە . چەند جارێك
چوو بوو ، هیچی لێ دەسگیر
نەبوو بوو .
(٩) نموونەی ئەمانە : بێخودو
ڕەمزی‌و کەمالین .
(١٠) بەتایبەتی چوارینێك کە کرابوە
بە کارتی جەژن‌و یەکەم دێڕی
ئەمەبوو :
جەژنی کەسێك موبارەکە
سەربەستو حوڕ بژی
(١١) پارچە شیعرێکی بە ناوبانگی
ئەم مەیدانەی ئەوەیە کە لە
گەلاوێژدا بە ناوی یەکێکی
ترەوە بڵاوکراوەتەوەو ڕەفیق
حیلمی لە بەرگی دووەمی
( شیعرو ئەدەبیاتی کوردی )دا
بە ناوی کەمالی یەوە بڵاوی
کردۆتەوەو کەوتۆتە ناو
کۆمەڵە چاپکراوەکە
شی‌یەوە سەرەتاکەی ئەمەیە :
سەرێ بۆ بەرزی‌ی وەتەن
نەکا دەرد
وەکو شێت نەبێ وێڵی کەژو
هەرد .

# رۆژ

**محمد رشيد فتاح**

رۆژ نزیکترین ئەستێرەیە لەزەویەوە ، هەروەکو ئەستێرەیەك لە ملیۆنان ئەستێرانی گەردوون سەیردەکرێ ، ئەوەی تائێستا بۆزانست ساغبۆتەوە ئەوەیە کە رۆژ بایەخدارترین هەسارەیە بۆ مرۆڤ ، خێرایی سورانەوەکەی

...ر٠٧ حەفتا هەزار میلە لە کاتێکدا ، ئەمە وایکردووە گەلێك پرسیاری بێوەرام بە خەیاڵماندابێت ، لەوانە ئەوەیە ، کە ئایا مرۆڤ بە تەواوی هەست بە سوڕانەوەی خۆی دەکا بە دەوری رۆژدا ؟ ئایا دەزانی کە لە چ باروودۆخێکدا دروستبووە . ئەگەر بێتوو ئەو برەتیشکەی پێمان دەگا لە رۆژەوەتۆزێ کەم بکا یازیادێ ئەو کاتەناتوانین هەڵکەین چونکە ئەگەر کەم بێتەوە ئەوا دەمەیینو دەبین بەسەهۆڵ ، ئەگەریش زیاد بکا دەسووتێینو دەمرین. لە راستیشدا ئەو چەرخە بەستەلەکەی لە کۆنا رووی‌داوە دەگەرێتەوە بۆ کەم بوونەوەی برێکی‌کەم لە تیشکی رۆژ . بەڵام لە بەختی ئێمەیە کە رۆژ ناجولێتەوە ، وەك هەندێ ئەستێرەی دی نیە کە وەك دڵ لێ ئەدا یا دەتەقێتەوە .

تیرەی رۆژ نزیکەی ...ر٨٦٤ میل‌دەبێ ، بە بەراووردی لەگەڵ تیرەی زەویدا کە ..ر٩٠٧میلە بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازیەکەیان ئێجگار گەورەیە لە نێواندا ، پلەی گەرمیش ...ر٦ پلەی پەتی‌یە ، لە سەر رووەکەی ، بەڵام لە ناوەندی چەمەکەیدا گەرمایی دەگاتە ...ر...ر٢٠ ملیۆن پلەی پەتی (کالڤن) . لە بارەی قەبارەشەوە رۆژ ...ر...ر٣٠ر١ ئەوەندە قەبارەی زەوی دەبێ ، کێشەکەشی...ر٣٣٠ئەوەندەی‌زەویە لە بەر ئەوە دەبینین کە چڕی رۆژ لە چڕی زوی کەمترە رێژەی چڕی رۆژ ٤ر١ ی چڕی ئاوە کە چڕی زەوی ٥ر٥ چڕی ئاوە .

رۆژ بە تەواوی تەنێکی گازیە وە ئەو گازانەی ناوچەی چەتەکەی زۆر خەستەو پاڵەپەستۆی زۆر لە سەرە . بەڵام دیوی دەرەوەی گەلێك خاوەو زۆر کەمە

لەگەڵ ئەوەشا رۆژ بەتەواوی تەنێکی گازیە ، کەچی وەکو تەنێکی رەقە بەدەوری خۆیا ناسورێتەوە ، لەبەرئەوە هەر بەشێك لەسەر رۆژ بەخێراییەکی جیاواز دەسوورێتەوە لەوی دی ، گازەکانی ناوچەی ئیستوا بە (٢٥) بیست‌وپێنج رۆژ بە دەوری خۆیانا دەسورێتەوە ، وە ئەگەر بێتو (٤٠) پلە بەرەوژوور یا بەرەوخوار برۆین تەماشا دەکەین بە ٥ر٢٧ رۆژ دەسوورێتەوە ، بەڵام لە پۆلەکاندا بە ٣٤ رۆژ دەسوورێتەوە ، خولاندنەوەی رۆژ بەدەوری خویدا بەم شێوەیە بە ئاسانی بەدی‌دەکرێ بە هۆی جولانی پەڵە رەشەکانی سەر رووی رۆژ ، ئەو رووەی رۆژ کە ئێمە دەیبینین پێی دەوترێ ( ناوچەی رووناك )هەر لەم ناوچەیەشدایە کە پەڵەکانی سەر رۆژ دەردەکەون ، وە ئەم پەڵانە بە هۆی تەلەسکۆپەوە بۆ یەکەم جار لەلایەن زانای ئیتالیایی کالیلوەوە بینراوەتەوە ، وە لە پێش گالیلۆشە وە چینیەکان هەستیان بە بوونیان کردبوو ، وە هەندێ جاریش ئەو پەڵانەی کە گەورەن دەتوانین بەبی تەلەسکوپ بیان بینین ، لە کاتێکدا کە رۆژ زۆر روناك نەبێت ، بۆ نمونە لە کاتی ئاوا بوونا کە تەمێکی تەنکی روون بەری تیشکەکەی بگرێت،یا بەهۆی تەلەسکۆپێکی بچوکەوە دەتوانین پەڵەکان ببینن .

ئەگەر پرسیارێ بکەین بلێن ئایا پەڵەکانی سەر رۆژ چی‌یەو لە چی پێك‌هاتووە ؟ زاناکان لە وەڵامدا دەلێن ئەو مادانەی پەڵەکانی لێ‌دروستبووە بەتەواوی نەزانراوە ، لەگەڵ ئەوەشا دەتوانین بلێن کە لە دوو ناوچە پێك‌هاتووە ، ناوچەی ناوەراستی کەرەش‌و تاریکە پێی‌دەلێن ئەمبرە ( umbra ) وە ناوچە رەشەی دواوە پێی‌دەلێن پێن‌ئەمبرە ( penumbra ) ، ئەم پەڵانە لە شێوەی ژێرپیالەدان وە پلەی گەرمایی سەر ئەم پەڵانەکە ..٥ر٤ پلەی



وێنەی (٢) چینەکان کە رۆژی پێکهێناوە

بەتیە . هۆی ئەمەشە کە ئەم پەڵانە تارێك دوردەکەون لە ناوچەکانی تری رۆژدا .

لە ناوچەی ئەم پەڵە رەشـانـەدا ناوچـەیەکی موگناتیسی بە هێز هەیە بەڵام تائێستا هۆی بوونی ئەم ناوچە موگناتیسیە نەزانراوە ، ژمارەی ئەم پەڵانە لـە ماوەیەك بۆ ماوەیەکی‌تـــر جیاوازە کـــە پێی‌دەڵێن ( سووری پەڵەکانی سەر رۆژ ) ، کە مترین ژمارە ئەم پەلانە لە ماوەی ساڵێکدا ببینرێ پەنجا کۆمەڵە پەڵەیە . زۆرترین ژمارەشی دەگاتە (٥٠٠) کۆمەڵەیە یا زیاتر .

ئەم سوورەی رۆژ بۆ ماوەی (١١) ساڵ درێژ دەبێتەوە جاری واش هەیە لە ١١ ســـاڵ تێدەپەرێ . بەم سوورە دەڵێن سووری پەڵەکانـی ســـەررۆژ . گەورەترین کۆمەڵە پەڵە لە ساڵی ١٩٤٧ بو یەکەم جار بینرا کە ناوچەیەکی داپۆشی‌بوو لە ٢,٠٠٠ ملیون میل چوار گۆشە زیاتربوو .

زۆر جار لەگەڵ ئەم پەڵانەدا جۆرە پەڵەیەکی کە دەردەکەوێ پێی دەڵێن پەڵەی رونـــاك فاکیەلـــە ( faculae ) : ئەم پەڵانەوا دەردەکەوت کـە لـــە ئاستێکی بەرزتردا بن لە پەڵە تاریکەکان ، زۆر جار ئەم پەڵانەپێش پەڵە تاریکەکان دەردەکەون ، لە کاتی ئاوابونیشدا پەڵە تاریکەکان زووتر وون‌دەبن وەك لـە پەڵە رووناکەکان

ئەوەی زۆر سەیرە لە سەرووی رۆژ ئەو کلپە ئاگرانەیە کە لە سەر رووەکەیەوە بەرزدەبێتە وەبـــۆ بەرزترین خاڵ لە ئەتمۆسفیری دیوی دەرەوەی رۆژ کە پێی دەڵێن پرۆمەنەنس ( prominence ) . بەرزی ئەم کلپانە لە سەر رووی رۆژ دەگاتە ١٠,٠٠٠ میل ، بوونی ئەم کلپانە بـــەم گەورەییە بـــە زۆری دەگەرێتەوە بۆ ئەو گازە خەست بوانەی کە لە دیوی دەرەوەی ئەتمۆسفیر رۆژدان نەك بۆ ئەو ماددانەی لەسەر رۆژەوە دەردەچن .

بۆ زانین‌و ناسینی ئەو مادانەی سەر رۆژ یـــا بلێین ئەو مادانەی کە رۆژیان لێ‌دروستبووەو دابەش بوونیان بەسەر ناوچەکانـــی رۆژا پێویستمان بـــە جیهازێك هەیە پێی دەڵێن

lyto monochromatic filter

وە بو شی‌کردنەی شەبەنگ زۆر پێویستمان بـــە ( شیکەرەوەی شەبەنگ ) هەیـــە spectro scope یاثامێرێکی کە پێی دەڵێن ( شیکەرەوەی هێڵەکانی رۆژ ) spectro heliograph یـا دەتوانین رەنگەکان بلێین شەپۆلەکانی پێ جیا بکەینەوە ، وە کام شەپۆلەمان مەبەســـت بێت هـــەلیبژێرین‌و لــــێبکۆلینەوە ، بۆلێکۆلینەوە لە سەر ئەتمۆسفیری رۆژ ئامێرێك بەکار دەهێنین کە پێی‌دەڵێن ( coronograph )

دروستبوونی رۆژ زۆر ئالۆزو سەیرەو زۆر زەحمەتە بە تەواوی بزانین رووەکەی چیەو لە چـــی پێك‌هاتووە ، رووبەکی یەك پارچـــەی نیە وەکـــو تەنەرەقەکان ، بەڵکو هەر پارچەیەکی بە خێداییـــەکی جیاواز دەسورێتەوە لە وی دی ، هەر وەکـــو لـــە پێشەوە باسمانکرد ، لەگەڵ ئەمەشا دەتوانین رۆژ لە ناوەوە بۆ دیوی دەرەوە بکەین بە چەند مینێکەو ، کە بە ناوك دەست پی‌دەکا کۆر ( core ) ، کـــە گەرماییەکی زۆر زۆری لێوە دەردەچێ . دوای ئەو چینێکی فراوانتر دێ لە بەشی ناوك ، ئیشی ئەم بەشە گواستنەوەی گەرماییە لە شێوەی تیشکدا بۆ سەر ، رۆژ چینی سێ‌یەم لە رۆژ دەکەوێتە دیـــوی دەرەوە پی‌دەڵێن chromosphere

ئەستورەکەشی ٣,٠٠٠ میلە ، ئەم چینە لەکاتی رۆژ گیرانا بە تەواوی دەردەکەوی ، دوای ئەم چینی ( کرۆنە ) ( corona ) دێت‌کە ناتوانین بە چاو ببینین مەگەر لە کاتی رۆژ گیرانی تەواو دا نەبێ . ئەو گازانەی لەم ناوچەیەدان پاڵەپەستۆیان کەمە ، ئەمەش سوودی بۆ ئێمە هەیـــە ، ئەتۆمـــەکانـــی ئەم ناوچەیە بە خێراییەك دەسورێنەوە کە لەگەڵ ئەو

پلەگەرمییەی لەم ناوچەیەدا هەیە کە دەگاتە ...ر...را پلەی‌پەتی . ئەگەر بهاتایە هەموو چینەکانی رۆژ بەم پلە گەرمییە تیشکیان بدایەتەوە ئەوکاتە سەر زەوی بێ‌ئەندازە گەرم دەبوو .

ئێمە دەزانین کە رۆژ تۆپێکی گازییە ، بەڵام ئەوگازانە کە ئەم رۆژەیان لێ‌دروست‌بووە چ جۆرە گازێکن . زاناکانو شیکەرەوەکانی شەبەنگی رۆژەبۆیان دەرکەوتووە کە ( هایدروجین ) بەشێکی گەورەی پێك‌هیناوە لە رۆژ ، وە رێژەی ئەم گازە لە رۆژا دەگاتە ٧٠٪ هەتا ٨٠٪ دووەم گاز کە رۆژی‌لێ‌دروست بووە ، گازی ( هیلوم ) ە کە لە هایدروجین قورسترە .

پێویستە لێرەدا ئەوە بزانین کە گازی هیلێوم بۆ یەکەم جار لەسەر رۆژ دۆزرایەوە نەك لەسەر زەوی ، ئەمیش لە ئەنجامی شی‌کردنەوەی شەبەنگی رۆژ بوو ، لەلایەن ئاسمان ناس ئنیگلیزیەوە ( لۆکیر ) لە ساڵی ١٨٦٩ کەخەریکی بەکارهێنانی سپیکتروسکوب بوو چاوی بە یەهێلی فرانهۆفەر کەوت لە سەر پەردەکە ، بەڵام (لۆکیر) لەکاتی خۆیا نەیتوانی بزانێ کە ئەم هێڵانە دەگەرێنەوە بۆ چ ( توخمێك ) لە توخمە کیمیاییەکان ، ناوی نابە (هیلێوم) ، پاش ئەم رووداوە بە (٢٥) ساڵ توانیان لە سەر زەوی هیلێوم بدۆزنەوە، پاش ئەوەش توانیان جگە لە هایدروجینو هیلێوم چەندەها توخمی کە بدۆزنەوە ، وەکو کاربۆن ، نایترۆجینو ئۆکسجین هەروەها هەڵمی کانزاکان وەکو مەگنیسێومو ئاش ، هەتائێستا توانراوە (٧٠) توخم لە سەر رۆژ بدۆزنەوە ، لەو (٩٢) توخمەی لە سەر زەوی هەیە ، یا بلێن ئەو توخمانەی لە سەر زەوی دۆزرانەتەوە ، چونکە بە پێی خشتەکەی زانای رووس مەندەلیف چەند توخمێکی دی ماوە لەسەر زەوی کە بدۆزرێتەوە ، زاناکان بە هیوان کە هەموو توخمەکان لە سەر رۆژ هەبێ .

ئەو پرسیارە گرنگەی لەم باسەدا خۆی راست دەکاتەوە ئەوەیە ، ئایا رۆژ ئەو گەرما زۆرە لە کوێوە دەهێنێ ؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو کاتەوە دروست‌بووە هەتا ئێستا بەردەوامەو بۆ ...ر...ر...١ هەزار ملێون ساڵی دی بەردەوام دەبێت ، دوای ئەوەش بۆ ...ر...ر...١ هەزار ملێون ساڵی دی زیاتر ، ئەگەر بهاتایە وەکو خەڵوز بسووتایە دەمێك بوو کوژابووەوە ،

کاتێك کە گەردیلەی‌یەکی لە توخمە کیمیایەکان لەگەڵ گەردیلەیەکی‌کەدا لەهەمان توخم‌یەك دەگرن بەم کردارە دەڵێین پێکەوەلکان ( fusion ) فیوژەن ، وە لە ئەمەدا گەرمایەکی زۆر پەیدادەبێ .

لە بەر ئەوەی گازی هایدرۆجین زۆر زۆرە لە سەر رۆژ وەگەرمایی سەررۆژ دەگاتە ...ر...ر١٤ پلەی پەتی،گەردیلەکانی ئەم گازە یەك دەگرت و گازی هیلێوم دروست دەبی ، گەرمایەکی بێ‌شومار پەیدادەبێت ، دەتوانین بلێن کە بۆمبای هایدرۆجین لە سەر هەمان رێگە دروست‌کراوە یابلێن بەهەمان رێگەدا تێ‌دەپەرێ .

کرداری پێکەوە لکان ( fusion ) کە لە سەرەوە باسمان کرد بەسێ قوناغدا تێ دەپەرێ .

لە قۆناغی یەکەمدا ناوکی دوو گەردیلەی هایدرۆجین یەك‌دەگرن ، دیوترۆن دروست دەبێ (یا هایدرۆجینی قورسی)و پوزیترۆن دە ـ دەچێ ، لە قوناغی دووەمدا ( دیرنزۆن )ە کە لەگەل ناوکێکی هایدروجین‌دا یەك‌دەگرێ بۆ ئەوە زرِتوخمی ( isotope ) هیلیوم دروست‌بکات ، کە کێشەی گەردیلەییەکەی (٣) سێ‌یە لەگەڵ دەرکردنی گەرمایەکی زۆر لە شێوەی شەپۆلی کورت‌دا یا ( تیشکی‌گاما ) دا .

لە قوناغی سێ‌یەمدا دوو زرِتوخمی هیلیوم کە کێشەی گەردیلە ییەکەیان (٣) یە ، یەك دەگرن بۆ ئەوەی (هیلێوم) یکی ئاسایی دەرکردنی دووپرۆتون دا ( یا دوو ناوکی هایدروجین ) ، و ئەم پرۆتونانە بەرەڵادەبن بۆ ئەوەی لەهەمان کرداردا بەشداری بکەن، هەر وەکو لە سەرەوە باسمانکرد ..

ئەم کرداری پێکهینانەی (الترکیب) هیلیوم کە لە ناوەرۆکی رۆژدا روودەدات پێی دەڵێین کارلێکی (تفاعل) پروتۆن لەگەڵ پرۆتۆن .

وە زۆر لە زاناکان رایان وایە کە زوربەی ئەستێرەکانی ئاسمان بەهەمان شیوەگەرمایی بەدەست‌دەهێنن .

رۆژ تیشك دەنێرێ بۆ سەر زەوی لە کورت‌ترین شەپۆلەوە تا درێژترین شەپول بێجکە لە شەپۆلی رووناکی کە سەر زەوی رووناك دەکاتەوە و درێژی شەپۆلەکەی ( wavelenyth ) لە نێوان ..٣٩٠ هەتا ..٧٥٠ ئەنگسترۆمایە .

لە ناو ئەم نیشانەدا تیشکی (×) هەیە ، ئەم تیشکە مرۆڤ لەسەر زەوی دەکوژێ ئەگەر بێتو بێتە

ـو ئەتموسفیری رۆژەوە .

ئەو برە گەرمایییەی دەگاتە سەر زەوی لە خولەکەیەکدا (دقیقە) بۆ سم . دەتوانی پلەی گەرمی ئاو ١ غم ٩٥ر١ پلە لە پلەی سەدی بەرزبکاتەوە (٥ر٣) پەی ئەهرەنهایتی . ئەم برە تیشکە نەگۆڕە کە رۆژ دەینێرێ بۆ سەر زەوی . هەر ئەمەشە کارێکی وای کردوە کە بتوانین لە سەر زەوی بژین .

رۆژ بێجگە لەو تیشکانە کە دەینێرێ ، زۆر پارچەی ووردوو لەبەك نەچوو بەلێشاو دەنێرێ وەکو گەردیلەی توخمەکان یا ناوکی هیلیوم و ئەلکترونات و یا ئەو پارچانەی کە بارگەیەکی کارەباییان هەلگرتوە ، بە تایبەتی لە کاتی دەرکەوتنی پەلەکاندا یا لە ئەنجامی نەفینەوەیەکدا لە (پارچەیەك)ی سەر رۆژ ، ئەم پارچانە کاتێك نزیك دەبنەوە لەکایەی موگناتیسی (مجال مغناطیس) زەوی ، موگناتیسیەتی زەوی رایان دەکێشێ بۆلای لە سەرو ئەتموسفیری زەوییەوە جۆرە روناکیەك و تیشکێك دروستدەکەن لە شێوەی کۆلکە زێرینەیەکی پرشنگدار دەکات . یا لە خۆر ئاوا بوونی پۆلێ سەروو وە ئەم کردارەی رۆژ ناو دەبرێ بە (رەشەبای رۆژ) لە ئەنجامی ئەم رووداوانەدا زاناکان رایان هاتۆتە سەر ئەوەی کە بلێن زەوی پارچەیەکە لە ئەتموسفیری رۆژ . وە هەر هۆی ئەمەشە کە زاناکان ناتوانن بە تەواوی قەبارەی رۆژ دیاریبکەن .

دروست بوون و نەمانی رۆژ :

زاناکان رایان وایە کە رۆژ لە پەلە هەورێکی گازی ئێجگار گەورە دروست بووە . کە ئەم پەلە هەورانە لە گەردووندا زۆر بوە لە کاتی دروستبوونی رۆژا

بەرە ئەم گازانە گرژ بوون و چونەتەیەك و لە ئەنجامدا زۆر گەرم بووەو بەدەوری خۆیدا خولاوەتەوەو پالە پەستویەکی زۆر لە سەر ناوکەکەیبووە هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی پلەی گەرمی لە ناوکەکەیدا بەرز لە ئەنجاما کارلێکی ناووکی (تفاعلات نوویە) دەستیپێکردووە ، بێتەوە بەرەبەرە بووە بە ئەستێرەیەکی چەقیو لە جێگای خۆی .

زۆر لە زاناکان رایانوایە کە رۆژ پاشکردنی هەموو سووتەمەنیەکانی یا تەواو بوونی کارلێکی ناووکی دەبێت بە ئەستێرەیەکی بچوکی درەوشاوە ، بەلام ئەمەشتێکە کە زۆر زۆر دوورە لەوانەیە پاش

...ر...ر...رە پێنج هەزار ملیون سالی دی روویدات

**لێك دانەوەی وشەکان :**

ناووك نواة nucleus
**گەردوون الكون**
قەبارە الحجم
**پەلەی رۆژ البقع الشمسیه sunspot**
**چەق المركز**
**گەردیلە الذره Atom ، کێشەی گەردیلەی الوزن الذری**
**پێکهێنان الترکیب synthesis**

**شەپۆلی رووناکی ( الموجات الضوئیه ) .**

ئەو شەپۆلەیە دەکەوێتە نێوان تیشکی سەردوینە وشەی و تیشکی ژێر سوورەوە . ئەم دووتیشکە چاوی مرۆڤ ناتوانێ هەست بەبوونیان بکا ، بەلام تیشکی روناك چاوی مرۆڤ دەتوانی هەستی پێبکات و ببینی .

**پۆ زیترن پارچەیەکە لە گەردیلە وەکوو ئەلکترون وایەبەلام بارگەیەکی پۆزیتیف ی هەلگروە**
**بارگەی بوزیتیف (الشحنه الموجبه )**

**هێلی نرانهۆفەر**
ئەو هێلە رەشانەیە کە لە ناوشەبەنگی رۆژا دەردەکەوێ کەکاتێك تیشکی رۆژ بەناو (ئاوێزە) دا (موشور) ببەین ، حەوت رەنگمان بۆ دەردەچێ لە ریزی یەکەوە بە ناو ئەم رەنگانەدا خەتی رەش هاتووە ، ئەمیش دەگەرێتەوە بۆ هەلمێ ئەو کانزانەی لە سەر رۆژن

**پلەی پەتی / ئەو پلەی گەرمییە کە پلەی سفری ٢٧٣ پلەی سەدییە**

**ئەم نوسینە لە کتێبی ( زانستی گەردون )**
**Astronomy**
**وەرگیراوە کە لە نوسینی Lain Nicolson**
**وبلاوکردنەوەی**
**Hamlyn Publishing Group Limited**

**کە لە ١٩٧٧ دا لە چاپدراوە .**

# هەندێک بەرهەمی کتێبخانەی کوردی




## دیوانی وەفایی

● لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، لە زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپووری ئەدەبی کورد ، لەم دواییەدا دیوانی میرزا عەبدوڕڕەحیمی سابلاخی کە نازناوی ( وەفایی ) یە کەوتە بازاڕەوە ، ئەم دیوانە کە پێنجەمین چاپی دیوانی وەفایی‌یە لە لایەن محەمەد عەلی قەرەداخی‌ی نووسەرەوە لێ ی کۆڵراوەتەوە.

دیوانەکە سێ‌بەشە بەشی کوردی ، بەشی فارسی ، مەسنەویات ، لە پێشەکی‌ی کتێبەکەدا پێنج وێنەی زەنکرۆغرافی بلاوکراوەتەوە ، چواریان هی ئەو نوسخەیەیە کە ئەم دیوانەی لەسەر تۆژینراوەتەوە ، ئەوی تریان هی پارچە شیعرێکی فارسی‌یە .

نووسەر لە پێشەکی‌یەکەدا ئاشکرای کردووە ، چی ڕێبازێکی بەکار هێناوە بۆ تۆژینەوەی ئەم دیوانەو ئەو هەوڵانەی داویەتی بۆ تۆمارکردنی هۆنراوەکانو باسی دەستنووسەکە دەکاتو ئەنجا دێتە سەر بەسەرهاتی ژیانی وەفایی ، ناوی ، ساڵی لەدایکبوونی ، ناو شۆرەتی لە سەردەمی خۆیدا ، ئەنجا کۆچی دوایی وەفایی ، پێش ئەمانەش باسی مەبەستەکانی شیعر لە لای وەفایی دەکات ، کە لەمانەش دەبێتەوە هۆنراوە کوردی‌و فارسی‌و مەسنەویەکانی وەفایی تۆماردەکات.

تۆژینەوەر لە پێشەکی‌یەکەدا دەڵێت :

دیوانی وەفایی یەکێکە لەو دیوانانە تائێستا چوار جار چاپ کراوە بەڵام بەداخەوە ، کە هەرجارەی کۆمەڵێك شیعری تێدا زیادکراوەو چەند گولۆلە گرێ‌کوێرە ناو شیعرەکانی خراوە ، بە شێوەیەك وائەبێ پارچە شیعرێك دەخوێنرێتەوەو هیچی لێ‌وەرناگیرێ‌و نازانرێ باس‌و مەبەست لە شیعرەکەدا چییە !

ئەنجا لەبەر ئەم هۆیەو چەندین هۆی‌تر، مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی ئەو دەستنووسەی دەستی کەوتووە ، هەوڵی‌داوە ساغی بکاتەوەو بیگەیەنێتە چاپ، لەم هەوڵدانەشیدا سەرکەوتنی بەدستهێناوە ، ئەگەرچی لە لایەنی ئەوەی کە واتای هۆنراوەکانی لێك‌نەداتەوەو ووشە قورسەکانی لە پەراوێزدا ڕائە نەکردووە ئەمەش وا لە خوێنەر دەکات لە هەندێك ڕستەو مەبەستی وەفایی لێ‌نەگات ، بۆیە لەم خاڵەدا

**مكرم رشيد تاله‌بانی**



ره‌خنه‌ی لێ‌ده‌گرێت . به‌م پێش ئه‌وه‌ی ڕه‌خنه‌ی ئاراسته بکرێت خۆی ددان به‌وه‌دا ده‌نێت که به‌خوێدا ڕانه‌به‌رمووه‌ته‌وه ڕاڤه‌ی هه‌موو دێڕێکی هۆنراوه‌کانی وه‌فایی بکات چونکه بۆی‌ده‌رکه‌وتووه ئه‌و کاره له توانای ئه‌ودا نه‌بووه ، له گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا ئه‌م دیوانه‌ی وه‌فایی پوخت‌ترین‌و نایاب‌ترین دیوانیه‌تی تاکوو ئێستا له‌چاپ درابێت .

## چه‌ند شاعیره‌ك د هه‌رێما به‌هدینان‌دا

له‌م دواییه‌دا ، له بڵاوکراوه‌کانی ئه‌مینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان کتێبێك به ناوی « چه‌ند شاعیره‌ك د هه‌رێما به‌هدینان‌دا » که‌وته کتێبخانه‌ی کوردی‌یه‌وه ، که ، دوکتۆر نافیع ئاکره‌یی ئاماده‌ی کردووه‌و ، کورته‌یه‌ك له مێژووی ژیانی ئه‌م شاعیرانه‌ی خواره‌وه له گه‌ڵ چه‌ند نموونه‌یه‌ك له شیعره‌کانیانی گرتووه‌ته خۆی ، شاعیره‌کان ئه‌مانه‌ن :

مه‌لای جزیری ، فه‌قێی ته‌یران ، ئه‌حمه‌دی خانی ، مه‌لای باته‌یی ، ئه‌حمه‌د موخلیص .

ئاماده‌که‌ری ئه‌م کتێبه له سه‌ره‌تایه‌کی چوار لاپه‌ڕه‌یدا ووشه‌ی « به‌هدینان »ڕاڤه ده‌کات‌و به‌پێی بۆچوونی خۆی سنووره‌که‌ی ده‌ستنیشان ده‌کات ، هه‌روه‌ها ئه‌و نموونانه‌ی بۆ شیعری ئه‌م شاعیرانه‌ی هێناونه‌ته‌وه ، لێیان کۆڵاوه‌ته‌وه‌و بیروڕای چه‌ند نووسه‌رێکی تریشی له‌سه‌ر هێناونه‌ته‌وه .

ئه‌وه‌ی شایانی باسه ، دوکتۆر نافیع بۆ ئاماده‌کردنی ئه‌م کتێبه سوودی له «١٨» سه‌رچاوه‌ی کوردی‌و عه‌ره‌بی وه‌رگرتووه .

## « تێگه‌یشتنی راستی » و شوێنی له ڕۆژنامه‌نووسی کوردیدا

که‌لێنێکی تری کتێبخانه‌ی کوردی به کتێبێکی بایه‌خدارو بێ‌وێنه پڕکرایه‌وه ، ئه‌وه‌بوو له‌م ماوه‌ی دواییه‌دا دکتۆر که‌مال مه‌زهه‌ر ئه‌حمه‌د به شێوه‌یه‌کی ڕێك‌و پێك‌و قه‌شه‌نگ کتێبی « تێگه‌یشتنی راستی » و شوێنی له ڕۆژنامه‌نووسی کوردیدا بڵاوکرده‌وه که له لایه‌ن کۆڕی زانیاری کورده‌وه له‌چاپ‌دراوه .

ئه‌م کتێبه نرخی تایبه‌تی‌ی خۆی هه‌یه‌و شوێنێکی دیاری‌ی له کتێبخانه‌ی کوردیدا ده‌بێت چونکه تاکوو ئێستا یه‌که‌مین کتێبه ، وا به شێوه‌یه‌کی دوورو درێژ له‌سه‌ر ڕۆژنامه‌یه‌کی کورد بدوێت‌و له هه‌موو لایه‌که‌وه له ده‌ورو کاریگه‌ری‌ی ئه‌و ڕۆژنامه‌یه بکۆڵێته‌وه ، ئه‌و ڕۆژنامه‌یه‌ش وه‌ك ده‌زانین ڕۆژنامه‌ی « تێگه‌یشتنی

ڕاستی » یە کە یەکەمین ژمارەی لـە یەکـــەم ڕۆژی کانوونی دووەمی سالی ١٩١٨دا بلاوبـــووەتـــەوەو دوازمارەشی لە ڕۆژی ٢٧ی کانوونی دووەمی سالی ١٩١٩دا دەرچووە واتە بە سەریەکەوە تەنیا سالێكو ٢٦ ڕۆژ زیاوە . هەرچەندە ژمارە (٦٥) لە ســـەر لاپەڕەی دوا ژمارەی تێگەیشتنی ڕاستی چاپکراوە بەلام بە سەر یەکەوە تێگەیشتنی ڕاستی (٦٧) ژمارەی لێچاپکراوە .

کتێبەکە ئەم بەشانەی گرتووەتە خۆی : پێشەکی، چەند لاپەڕەیـــەك دەربـــارەی مێژوو و بایەخـــی ڕۆژنامەنووسی . چمکێك لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی ، کەیو چۆن « تێگەیشتنی ڕاستی » دەرچووا، هونەری ڕۆژنامەنووسی لە « تێگەیشتنی ڕاستی » دا، زمـــانو ئەدەبو مێژووی کورد لە « تێگەیشـــتنی ڕاستی » دا ، ئەنجام ، لە گەل دوو پاشکۆدا ، یەکەمیان لیستەیەك بە ناوو شوێنو کاتی دەرچوونی ڕۆژنامە کوردیەکان.دووەمیان لیستەیەك بە ناوو شوێنو کاتی دەرچوونی گۆڤارە کوردیەکـان ، دوایـــی ئەمانەش پوختەی ناوەرۆکی کتێبەکە بە زمانی عەرەبی .

نووسەر دەلێت ئەو زانیارییانەی دەربارەی ئەم ڕۆژنامەیە بلاو کراونەتەوە یەکجار کەمنو لە هەلەش دوور نین ، بۆیەکا نووسەرەکان لەژمـــارەو ســـالی دەرچوونی ڕۆژنامەکـەدا هەلەیـــان کردووە ، دوای ئەمەش دەلێت : « وادیارە زاناو قەشەی بەناوبانگ ئەنەستاس ماری کرملی تاقە کەسە کاتی خۆی هەموو ژمارەکانی « تێگەیشتنیڕاستی » لە بەرگێکیتایبەتیدا پاراستووە . ئەو بەرگە لە گەل کتێبخانەی ماری کرملیدا دوای وەفاتی کەوتە دەســـت کتێبخانـــەی مۆزەخانەی عێراقیو ئێستە لەوێ پارێزراوە . »

ئەمەیە ئەردەکەوێت کە ئەنستاس ماری کرملی ئەبووایە ئەوانەیە هیچ کەســـێك چاوی بە هـــەموو ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە نەکەوتبایە . لەم کتێبەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کـــە لـــە دەرکردنـــی «تێگەیشتنی ڕاستی» دا نووسەرێکی کورد بەوپەڕی دلسۆزییەوە هەولی خزمەت کردنی ووشەو ئەدەبو مێژووی کوردی داوە . نووسەر لـەم بارەیـــەوە دەلێت :

« کە ژمارەکانـــی « تێگەیشـــتنی ڕاســـتی دەخوێنییەوە هەست بە دوو کەسی جیاواز دەکەیت ، هەست دەکەیت یەکێکیان بۆ کورد سوتاوەو بە زمانو هەستی ڕۆژهەلاتییەك دەدوێ . ئەوی تریـــان وەك ئینگلیزێکی دلســـۆزو ڕووناکبیرێکـــی ئەوروپایـــی دەنوسێ . ئەمیان وەك وتمان مێجەر سۆنە . هەرچی ئەوی تریانە زۆر لەوە دەکا شوکریلفەضلی بوبێ . »

دوکتۆر کەمال بەم کارە زانستییانەی بەرهـەمێکـــی بەرخی تری خۆی پێشکەش بە خوێنەرانی کورد کرد.

## ڕشتەی مرواری

لەژێر سەردێری « زمان شادەماری نەتەوەیە»دا مامۆستا علاء الدین سەجادی ، بەرگی شەشـــەمی کتێبە بەرخەکەی « ڕشتەی مرواری » بلاوکردەوە کە پڕی لە قـــەی خۆشو نوکتەی شیرینو ڕووداوی سەیرو بەسەرهاتی ئەنتیکەیە .

ئەم بەرگەی کتێبی « ڕشتەی مرواری » ئـــەم بەشانەی گرتووەتە خۆی : ــ تاڤگەی ئێلاخ ، لە باخی گولێك ، شەکراوی دەماخ . قـــەی ئەســـتەق ، ڕووداوەکانی ڕابوردوو . وەلامی بێوەلام . گەنجـــی درەخشان .

ئەوەی شایانی باسە مامۆستا سەجادی دەمێکە خەریکی ئەوەیە هەر سالێك یان چەند سالێك بەرگێکی ئەم « ڕشتەی مرواری » یە بلاوبکاتەوەو کتێبخانەی کوردیی پێ دەولەمەند بکـات ، لە ســـالی ١٩٥٧دا یەکەمین بەرگی « ڕشتەی مرواری » لەدایـــكبوو ، دیسان بەرگی دووەم سالی ١٩٥٧ ، بەرگی ســـێهەم سالی ١٩٥٨ ، بەرگی چوارەم سالی ١٩٦٩ ، بەرگی پێنجەم سالی ١٩٧٢ یەك بە دوای یەکدا لەچاپدران . بەلام ئەوەی کە لە کـــەمو کوڕییەکانی ئـــەم کتێبە دەگیرێت ئەوەیە کە شێوەی ڕێنووسی شێوەیەکـــی تایبەت بە مامۆستا سەجادی خۆیەوەیە ، لەبەر ئەوەیە چەند جیاوازییەکی لەگەل ئەو ڕێنووسەدا هەیە کە هەموو خوێنەرێکی کتێبە کوردیەکان شارەزایـــین ، لەمەیشـەوە چەند ڕستەو زاراو هـــەن لەلایـــەن خوێنەرەوە تێكدەئالۆزێنو لێیان تێناگات، جگە ئەمەش مامۆستا لە زۆر شوێنو ڕستەدا ڕاناوی (ی) ، کـــە ڕاناوی سێهەم کەسی تاکە ، لەگەل ئامـــرازی (ی)ی پەیوەندی نانووســـێت ، ئەنجا ئـــەوە بە هـــۆی لەبیرچوونەوە بێت یان هەرشتێکی ترەوە ئەوا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت ، بۆ ئەمەش چەند وێنەیـــەك دەهێنینەوە نەك مامۆستامان لێزیزبێتو بلێت ئەم شتە لە کتێبەکەدا وا ڕووی نەداوە ، بۆ وێنە لە یەکەم دێڕی لاپەڕە (٧)دا دەلێت : ــ

« ــ دوو برا لێفەیەکی بچووکیان کڕیبوو ، دنیا زستان

بوو شەوێ ویستیان پێبنون... » کە لێرەدا پێویستە بلێت « پێیبنوون » چونکە «ی»ی دوای «پێ» ڕاناوەو بۆ «لێفە»کە دەکەڕێتەوە .

هەروەها لە لاپەڕە (٨)دا دەڵێت : ــ « دزێك ڕێ لێ هەڵە ئەبێو ئەچێتە ماڵەکەی ، ... » کە ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە بلێت : ــ دزێك ڕێی لێ هەڵە ئەبێو .. ، لێرەشدا «ی»ی ڕاناوی سێهەم کەسی تاکی لەبیرکردووە کە بۆ «دز»ەکە دەگەڕێتەوە .

لەگەڵ ئەمانەیشدا ، ڕشتەی مرواری ، نرخی تایبەتی‌ی خۆی هەر هەیەو لە کتێبخانەی کوردیدا جێگای شایانی خۆی پێدراوە ، جگە لەمەیش تەنیا کتێبێکە ، لە کتێبخانەکانی زمانە جۆراوجۆرەکاندا لەوێنەی نی‌یە . ئەگەرچی کتێبەکە کەمێك گرانەو لە کڕین نایەت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی درێژ بۆ مامۆستا سەجادی دەخوازین‌و ڕەواجیش بۆ « ڕشتەی مرواری » .

## یادی قانع

ئەم کتێبە بریتی‌یە لەو ووتارانەی لەو کۆڕەدا خوێندرانەوە کە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی لە ڕۆژی ٧ــ٥ــ١٩٧٨ دا ، بۆ بیرەوەری‌ی سیازدەهەمین ساڵەی کۆچی‌دوایی شاعیری نەتەوەپەرست‌و نیشتمان‌پەروەری کورد « قانع » ، ڕێکی خست‌و ژمارەیەك لە ئەدیب‌و نووسەران وتاریان تێداخوێندەوەو بەشداری‌یان تێداکرد .

ئەم ووتارانەی خوارەوە لە دووتوێی کتێبەکەدان : ــ

- × ووتاری بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی .
- × ووتاری یەکێتی نووسەرانی کورد ــ لقی سلیمانی.
- × ووتاری دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی .
- × ووتەی کۆڕی زانیاری کورد .
- × لێکۆڵینەوەیەکو بەراوردکردنی شیعرەکانی شاعیرو هەڵوێستی ــ لە لایەن محەمەدی مەلا کەریمەوە .
- × قانعی بۆکڕووزو کەلەپشکۆی شیعری میللیمان لە لایەن کاکەی فەللاحەوە .
- × گیانی پاکی جاویدی قانیع ــ لە لایەن کەریم زەندەوە .
- × سوپاسی بنەماڵەی شاعیرو خوێندنەوەی وەسیەتنامەکەی ــ بورهان قانع .

هەروەها کتێبەکە چەند وتارێکی‌تری تێدایە لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا بڵاوکرانەتەوەو لە قانعی شاعیر دەدوێن ، جگە دوو ووتاری تر کە لە ئێزگەی کوردی‌یەوە سەبارەت بە هەمان بۆنە ئامادەکران‌و خوێنراونەتەوە .

لەو ووتارانەش : ــ ١ ــ لەبیرەوەری شاعیری ئازادا کە لەتیف هەڵمەت لە پاشکۆی کوردی‌ێ ڕۆژنامەی عێراقدا بڵاوی کردووەتەوە . ٢ ــ دیوەجینایەتی‌یەکەی هۆنراوەکانی قانع ، کاك کەمال غەمبار نووسیویەتی‌و لە ڕۆژنامەی بیری نوێدا بڵاوکراوەتەوە ٣ ــ ووتاری ئێزگەی ڕادیۆی کوردی لە بەغدا کە لە هەمان ڕۆژدا لەلایەن کاك خالید خۆشناوەوە لە ئێزگەوە خوێنراوەتە . ٤ ــ ووتاری کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد لە بەغدا کە مامۆستایان عەبدولڕەزاق بیمارو کەمال غەمبار لەهەمان ئێوارەدا لە ئێزگەی ڕادیۆی کوردی‌ی بەغداوە پێشکەشیان‌کرد . ئەم کتێبە ئەمنیدارێتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ــ بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری یارمەتی لەچاپدانی داوە ، هەروەها بورهان قانع ووتارەکانی کۆکردووەتەوەو سەرپەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووە .

## کازیوە

کازیوە ، لە ژێر ئەم نا ونیشانەدا کاك شێرکۆ بێ‌کەس پێنجەمین بەرهەمی خۆی بەچاپ گەیاند بەرهەمەکانی لەمەوپێشی لە ساڵی «١٩٦٧»ەوە دەستی‌پێ‌کرد ئەویش کاتێك «تریفەی هەڵبەست » جێ‌ی‌خۆی لە کتێبخانەی کوردیدا کردەوە ، دوای ئەویش یەك لە شوێن یەك ، « کەژاوەی‌گریان » ، « من تینوێتیم بە گڕ ئەشکێ » و « کاوەی ئاسنگەر » و « ئاسك » چوونە پاڵی بەرهەمە بەنرخەکانی « شێرکۆ بێ‌کەس » ەوە ، ئەم بەرهەمە نوێ‌یەی شێرکۆهەنگاوێکی سەر کەوتو وانەی تری ئەم‌شاعیرەیە کە لە بواری هۆنراوەی نوێی کوردیدا دەیهاوێژێت‌و هەردەم لە پێشکەوتن‌و داهێنانی نوێ‌تردایە .

ئەم بەرهەمە نوێ‌یەی شێرکۆ ، جیاوازییەکی بنەڕەتی‌ی لە گەڵ بەرهەمەکانی تری‌دا هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە هەمووی بریتی‌یە لە پۆستەرە شیعر ، کە لە «١٧٧» لاپەڕەی بە تابلۆ ڕازاوەدا سەدو چواردە پۆستەرە شیعری گرتووەتە خۆی .

لە نێوان خوێندنەوەی پۆستەرە شیعرەکانەوە ئەوە دەردەکەوێت کە شاعیر ووریاو زیرەکانە هەڵسوکەوت لە گەڵ رووداوەکانی دەروبەری خۆیو رووداوەکانی دوور لە خۆیو شتە زۆر ووردەکانی ژیانو شتە شاراوەکانی ئەودیوی ژیانو بەسەرهاتە ووردەکانی ژیانی رۆژانەدا دەکاتو گیانی هونەرمەندانەی هۆشیارو ووریاو زیرەکانەیان بەبەردا دەکاتو وێنەو تابلۆیەکی ئەمریان پێ دەبەخشێت .

دەبینین لە گەڵ چەوساوەو هەژارو دەربەدەرو بێ دەرەتانانی هەموو جیهاندا ئازار دەچێژێتو کۆڵێك غەمی مرۆڤی سەر رووباری نیلو شاری ئەسمەرەو حەیفاو سانتیاکۆو شاخی پیرەمەگروونو دۆڵی بو قاعی بە کۆڵەوەیەو بەم خەلکەی دەناسێنێتو هەڵویستی خۆی بە دەمی « جەمیلەو خالیدو مەم »ەوە دەربارەی رووداوەکان دیاری دەکاتو هەمیشە دووپاتی دکاتەوە کە لە گەڵ هێزە خێرخوازو پێشکەوتووخوازەکانی جیهاندایەو لە پێناوی دژدان بە ئیمپریالیزمو ستەمو زۆردا تێ دەکۆشێتو خۆشەویستیو سەربەستیو ئازادی دەپەرستێتو هەموو مرۆڤێکی تێکۆشەری هەموو ڤوژبنێکی ئەم جیهانەی دەوێت .

ئەم بەرهەمەی شێرکۆ ، ناوەرۆکێکی بەپێزو چڕو پوختی هەیەو بە داهێنانێکی هونەریی هونەرمەندانەی زیرەكو هۆشیارانە دەژمێررێتو سەرکەوتنێکی تری هەنگاونانی بەرەوپێشەوەچووی شاعیرێتیی تۆماردەکات .

لە گەڵ ئەوەشدا لایەنێك هەیە، کە دەبێت هەموو شاعیرێك ، ئاوورێکی چڕی لێبداتەوە ، ئەویش لایەنی زمانو دەستووری زمانە . هەروەکوو زانراوە دەبێت هەموو شاعیرێك زمانزانو زمانەوان بێت ، بەلام مەرج نییە زمانزان یان زمانەوان شاعیر بێت . ئەنجا ئەم لایەنی زمانەوانییە بە لای کاك شێرکۆوە لە هەندێك جێگادا بۆ پێداویستی شیعری یان بە هۆی کارتێکردنی زمانی ناوچەییەوە پشتگوێ خراوە . بۆیە حەزدەکەین کاکی شاعیر بۆ پوختترکردنی شیعرەکانی ئاوور لەم لایەنە بداتەوەو خۆی لە زمانی ناوچەیی دوورەپەرێز بکرێتو بپارێزێت .

بۆ وێنە لێرەدا هەندێك نموونە دەهێنینەوەو دەیخەینە بەرچاوی کاك شێرکۆو خوێنەران : لە لاپەڕە (٥)دا دەڵێت :

**تەنیا بە سەرهەلبڕینێ**
**برین لە کوێ بێ ئەبینم**
**هەژار لە کوێ بێ ئەمبینێ**

لێرەدا لەبەر سەروا « **سەرهەلبڕینێ** » و « **ئەمبینێ** » بەکاردەهێنێت . کەچی بێینە لای ڕاستی « **سەرهەلبڕینێك** »ە نەك « **سەرهەلبڕینێ** » چونکە سەرهەلبڕینەکە یەکجارەو وا پێکهاتووە « سەرهەلبڕینێك » بەلام لێرەدا بە تیپی ئابزوێن دوایی‌هاتووە بۆیە بووەتە «ێك» . هەروەها «ئەمبینێ» ڕاستتر ئەوەیە بلێت «**ئەمبینێت**»یان «**دەمبینێت**» لێرەدا دەرکەوت سەرواکەیان جیاوازە .

لە لاپەڕە «٧»دا دەڵێت : **نیگامی کرد بە پەپوولەو ..**

لێرەشدا کەوتووەتە هەلەیەکی زمانەوانی زەقەوە ، کە پێویستە بلێت « **نیگای کردم بە پەپوولە ...** » واتە ئەو نیگای «من»ی کرد بە پەپوولە کە هیچی لە «کێش»ی ڕستەکە نەدەگۆڕی !!

لە لاپەڕە «١٥»یشدا دەڵێت : **چووین بەپیر ئاسمانەوە ...**

جارێك هیچ کاتێك کورد نالێت «**بەپیر**» واتای «**پیر**» گەورەبوونو چوونە ناوساڵ دەگەیەنێت ، بەلام کورد دەڵێت « **چووین بە پیری یەوە ..** » واتە پێشوازیمان لێ کردو لەبەری هەستاین بەرلەوەی بگاتەجێ .

لە لاپەڕە(١٥٩)یشدا دەڵێت : « **بە دوا هۆنراوەی خۆشم ووت ..** » لێرەدا لە سەر ووشەی «خۆش» دەدوێین کە دوو واتا دەگەیەنێت ، یەکێکیان «خۆش»ە واتە شیرین یان بە چێژو تام ، ئەوی تریان کە شاعیر مەبەستیەتی «خۆ»یە واتە خودی شاعیر خۆیەتی. ئەنجا بۆ گومان پەیدانەکردن لەم جۆرە شوێنانەدا دەبێت ئامرازی «یش» بەکاربهێنین کە هەندێك بە زۆر یان بە ئانقەست ئەو «ی»یەی فڕێ دەدەنو ئەو گومانە لە ووشەدا دێتەکایەوە . دەبێت بلێت «**خۆیشم**» یان « **خۆمیش** » . ئەمە جگە لەوەی زۆرجار فرمانی تێپەڕی ئەم ووشانە بە تێنەپەڕ بە کاردەهێنێت وەك : مێشکی ... یان بژان ، سەرێکی بۆ خوران ... هتد، کە ڕاستتر وایە بلێت : بژاند ، خوراند ، سووتاند ، هەژاند .

« محفوظ مایی »

# بوهارا کوردستانێ

هوزانڤانێ پەیڤ شرینو گوتن نازك ، کوینا ئاڤ رێلێ تاری ـ بلبلێ ئاواز سڤك ئەڤینداری گەلەك رەنگو بێهنو بوێت گولا بو .. بهایێ ژیارێ دزانی ، ب گەلەك رێکا چویە کاروانێ ژیارێ ـ بو گەلەك تشتا ستران‌و لاڤژە گوتینو بکوتێت خو هاڤێتینە بەر سەمایێ . نو هەروەسا گازندەو دالەهی گەلەك ژ ژیارێ کرینە چنکو ئەوی تام‌کریە هەمی تەحلاتیا ژینێ . ما هەکە ژیان تەحل‌بو تە دڤێت تاما وێ چاوابیت !

بەلێ یا دسەر ڤێ هەمیێرا ئەوی ژین دیت بهەمی رەنگێت وێڤە بتەحلاتی ئو شیرینی .. چنکو چاڤێ وی بهایێ ژینێ دزانی ..

ئەڤا خارێ هوزانەکە ژ هوزانێت نالبەندێ نەمر یاکو بدەست خەتێ وی بخو هاتیەنڤیسین لسەر پەرەکێ زەرکیو پێتی هیڤدارم کو روژەك بهێت ئەم هوزانێت وی هەمیا پێکڤە بخوینین لسەر بەرێت زەلالو سپی ئەڤجا هیڤدارم ژ وان کەسا یێت کو هوزانێت نالبەندی لدەڤ هەین سەحکەنێ برێکە لێك خرڤەکەن دا گوتنا ساهیو زەلالو شرین یا هوزانڤانێ کورد (ئەحمەدێ نالبەند) پێشکێشی گەنجێت کورد بکەین خزمەتەکێ بکەین ژبو تورێ مە یێ کوردی .

ئو ئەگەرا مەزی ژ بەلاڤ‌کرنا ڤان هوزانێت (نالبەندی) ئەوە کو هەکە ئێکی دابیتەدلێ‌خو کومکرنا وان دا وجەکێ ژێ وەرگریت چنکو باشترین سەروکانیە ژبەرهندێ کو هەمی دەست نڤیسا وی بخو یێ لدەفتەرەکێ نڤیسین .

ئەو هوزانە ( ئەحمەدێ نالبەند ) یا ڤەهاندی رێستی ببوهارا کوردستانێ . هەکە ئەم بهێنو ڤرێزکێت وێ بچینەخارێ دێ‌بینین کانێ بوهار د چاڤێت هوزانڤانی‌دا یا چاوابوو . هوزانڤانێ مە سەرێ وی دەریا هزرا بو هەڤ دەما وەکی تەڤنێ ئالزی سەرێت ربا لێ دبەرزەبوون نەیێ تەنابوو د هناڤێت خودا ئەڤ چەندە دبو ئەگەرا هندێ کو ژ مال دەرکەڤینە بەر بەتەنو بەروژاو تەماشەکا گولیو چەمو ئاڤو چیمەنو روبارا بکەن داکو کوڤانێت خو ژبیرڤەبەت :

رۆژەکێ ، ل مەنمەان صەبرو قەرار
چووم چیای کو بچ چەمال هاتە بهار
( جنة الخلد ) مە دیت هاتیەخار
دل زەلال‌بوومە ژ ئاڤ غەبلی

وەکی ئەو بخو دبێژیت کو پشتی چاڤ ڤیهارا دولو چیا کەتی دلێ وی زەلال‌بو ژ ئاڤا شیلی هەروەسا ژبەرکو هندی دلی وی یێ ئالزیو کول‌بو گەلەك تشتێن دهاتنە بەرچاڤا وەکی وێ :

« طەیرو وەحشا کرە نالێنو ڤیغان »

جوانیا دەنگێ طەیرو تەوالا یا لبەر گوها بویە نالین ژبوکو ئەو ژ دل یێ برینداربو یاژویڤە سترانو ئاوازێت تەیرو تەوالا رونك نالینو گرینە سەحکە جوانیا ڤێ گوتنێو سڤکیو شەنگاتیا وێ :

« سەرملو دولو تزار ئالـو کەڤی هەر یەکێ شەرمە ژ یادی ڤەرەڤی »

هوسا ئەو جوانیا کەڤیا بەفرێ دیاردکەت نابێژیت . ( چیا پنیرپنی‌بوون ژ کەڤیا بەفری ) بەلێ دبێژیت هەرئێك هندە یا جوانە کو هەڤالا وێ ژێ

شەرمدکەتو هوسا هەمی ژێك ڤەرەڤین .

بهارا کوردستانێ برەنگەکێ هندێ مەزن دهێته قەشەنگیا وێ کو ژی شەرم بکەن :

( چەنەنێ شەرمە ژ عەردی خەجلی )

رەنگو بێهنا گولاو دەنگو ئاوازێن تەبراو گەشبونو بشکفتنا داروباراو هشیهشا بەلگو ئاڤاو کەسکیا زویرکو بەتەنالبەر چاڤێت هوزانڤانی ببونە خانمو کچك کو شەرمە ئەو هندە بەحسێ وان بکەنو چاوا گوتنێت وی دلێت وان بریندارکە :

« گوتە من بێ ئەدەبا بەسسە هوشە
ئەڤ ثەنائێ تەکری دل هەرشە
تیرەکە لجەرگئو دلا ما چکلی »

یا ژ هەما فەرتر ئەوە کو ئەز هوزانێ دانمە بەرچاڤێت تەو تو بخو بچاڤێ خو بخوینەو بهایێ وێ بهەلسەگرینەو بزانە شەنگیو دەلارلیو سڤکیا وێ چەندە .

هوزانا وی ئەڤەبە : ـ

وەرە پێش ڤێ غەزەلا تازە گەلەو
ئەی کەسێ تو ژ دلو چاڤ روهنو زلی
بکەعیبرەت کو چەوا چەرخو فەلەو
بە ئیرادا مەلیکێ حەڤ عەملی
روژەکێ ل مال مە نەمان صەبرو قەرار
چووم چیای کو بچە جەمال هاتە بهار
جەننەتو لخولدە مە دیت هاتیەخار
دل زەلالبوو مە ژ ئاڤا غەبلی
مەلەکا لاگرکرد صەمەدو عەمەل

من نەزەرکر چیمەنێ نەقشی نەزەل
نەقشێن دارو گیا فەیزە دگەل
هەر کولیلکەو لجهێ خو شوفەلی
بارئاالله چە زینەت هەیە وان
نوقط و خالو خەط و نەقشو نیشان
طەیرو وەحشا کرە نالینو فیغان
هەر یەکی صورەتەکێ بێ وەصلی
نێرگزا فەجرو سەحر خو فەهژاند
سوسنا خەملەڤەدا بخونچە بژاند
سیسنا چاڤ ڤەکرن دل هەرشاند
عاشقا پێتو گوری بەربوو دلی
سەرملو دولو نزار ئاڤو کەمەر
هەریەکێ شەرمە ژ یا دی قەمەرەڤی
ئەی خوناڤ ئەمرە شەمعێ لێ بکەڤی
رەقسو گوڤەندە گیانێ کەملی



چیمەنێ نازکە فەجرو سەحەرێ
رۆژ ژ قوببا فەلەکێ هاتەدەرێ
تە چ قودرەت هەیە لێکەی نەزەرێ
بە تەماشا تە کری پێ وەگلی
بە شەڤێ هش هشو با رەعدو برویسك
فەرمسان سەر چیمەنا شەوقەو کریسك
تەرکرن دارو گیا کرنەڤە لیسك (١)
ئاڤ وناڤ باغو چەمادا نەزلی
ئاڤو لولاڤ لبێرگا زڤرین
جوملە حەیوان ب ئاواز و خورین
طەیرو چویچك ژ دلو عیشق فرین
نەقشێ رەنگارەنگە لهەمیا حەصلی
تازەیا دەشتو چیا خاستە سەنا
مسکو عەنبەر وەریان سەر چەمەنا
دارو بار لەیەك نەقشینی رەنگ خەنا
قامەتا تەرحە نو تالێ قەبلی
برقین نورهە سحارو شەفەقێ
نەقشاند وەجهێ گیای خالو دەقێ
روح نەهێلا لچو لەشا وێ مەرەخێ
ئەی داو چەند تو غەمگیرو کولی
وەرنە پێش شکل جەمالا چیمەنێ
هەر کولیلکەك بخو بشکفتو کەنی
دا ژ دلا ژەنگو ڤرێژا فەرمنی
جەرگو مێلاك ژ غەمێ مانە حولی
نەڤەیە مالێ خزینا ڤیدەمێ
وی چ رەنگ دا ژ بەحرا کەرمێ
مە ڤەبوون دل ژ کولو دەردو غەمێ
بلبلا خانو سحارا گێوەلی
شەفەقێ داڤە سەرێ کوخ چەلیا
بێهاو بو کەفتە نەهالو گەلیا
بەژنو بالا گولو دارا خەلیا
چیمەن ب ئاڤو خوناڤێ بەطلی
نیسبەتو فەیزە ژ عەرشێ فەرمسی
نازرێ دینە ژ عیشقو هەوەسی (٢)
ئاوازەك هاتو ژ دەنگێ فەرمسی
(...) (٣) دل مە ژ خەطێ فەشلی

کەملین موعتەدلن عەردو هەوا
خانە ئاوازێ شرین طەیرو کەوا
برقین رەنگو جەمال دل فەلەوا
جەنەتێ شەرمە ژ عەردی خەجلی
نەزهەتو نازکیا وان چ خوشە
گوتە من بێئەدەبا بەسە هوشە
ئەڤ ئەنئێ تە کری دل هەرشە
تیرەکە لجەرگو دلا ما چکلی
گوتە من هەر کەسەکی هەر بژی
بەسە ئەڤ مەدحە جەما دێ مە کوژی
عاشقێ بخو بە غەما خو بوهوژی
تە لبەر وان قەکرن داڤو فلی
نورهەکە ژ زاتێ قەدیم خوش بەرقی
سورەتێ دەشتو چیایێ تەفقی
وی لسەر کریە تەجەلا شەرقی
ئەڤ کەمالا ژ جەمالێ نەقلی
بارك الله و تبارك وە تەعال
ئەڤ بهارا هو خودان لەونو کەمال
سورو شین کەسك زەرو قوردەمزیو ئال
ژ جەمالا صەمەدی یا فەصلی
بکە شوکرێ کەرەما زاتێ وەدود
هینە ئەڤ نەقشو نیگار دانیە وجود
بێ نیشان عەینی نەمو لفیکرو شهود
چاڤ مە کلدانە بەڤ رەنگو گلی
ئەحمەدی مەدحو سەنا هینە کرن
دەرگرن وی لهناڤێت مە برن
لازمە عیبرەتەکێ ژێ بگرن
دل مە سووتو کوزری ما شەپلی(٤)

(١) ئەڤ هورانە ژ نك مەلا رەشیدی ژ گوندێ پێشیلێ لناف بەروارێا ژووری گە هەشتە من .
(٢) لیسك = د بەرێدا بو سابوین چێکرنێ بکاردئینا . دا بنێ کلوسکی کونکەنو هندەك پیشی کەنێو هندەك خولیێ کەنە سەر نو دا ئاڤا کەل لوێ خولیتی کەن ئومانەکی دەنە بەر کونا کلوسکی دا ئەو ئاف ژوردا بهێتێو بو چێکرنا سابونێ بکاردئینا . دگوتە وی کلوسکی ( لیسك )
(٣) هەوەس = کێول ، رغبێ
(٤) (...) = حوبر ژێچوبو ئەز نەشیام نجوینم .
(٥) شەپلی = نە لێك‌دایو ڤێکدای ، ئالوزی .

# کە ئافرەت لە خۆی ئەبووری

● نجاة رفيق حلمي ●

سالّ هەزارو نۆسەدوو چلو یەکە ١٩٤١ رۆژی ١١-١١-١٩٤١ فەرمانی دامەزراندنم بە ماموستا لە شاری کۆیە دەرچووە !

فەرمانم هەلگرتو لەگەلّ دایکم بەرەو شاری کۆیـە رێمان کرد . خۆمو دایکم بەعەباو پێچەوە سەرتاپا رەش ئەچووینەوە .

ئیستاش کە ئافرەتی ئەم رۆژە ئەبینم بە سفوری‌و بێ عەباوپێچـە ئەگەرێن رۆژانی کۆنی خـــۆم یاد ئەکەمەوە ، سەرم ئەسوڕمێ کـــە چۆن رۆژمان ئەبردە سەرو ئەژیاین لە کاتیکا کە چوونە بازار لە ئیمـە قەدەغە بوو ئەگەرچی عەباوپێچــە پۆشیش بووین .

ئەمەی ووت‌و هەناســەیەکی پڕ لەداخی هەلکیشا . . نێ‌ی . . بەلێ یەکەم رۆژی هەنگاو نانم لە بواری ماموســـتایەتی‌دا لە ( مدرســــە کۆیسنجق الابتدائیه للبنات ) بوو . . سەدووده (١١٠) قوتابیم هەبوون .

خۆم ماموســـتا بووم ، خــــۆم بەڕیوەبەر بووم ، خــۆم یاریدەدەر بووم تەنانەت قوتابخانەکەشم خاوین ئەکردەوە ، بەو هەستەی کە پالّی پیوەدەنام . .

هەستی لیپرسراوی هەســتی خۆبەختکردن ، هەستی کاریکـــی نوێ‌ی شـــارســـتانیـــەتی بەدەســتەوەگرتن . کاریکی گرنگ‌و میژوویی لە ئەستۆگرتن . . جێ‌ی شـــانازی‌و ســـەربــەرزی‌و خۆچەسپاندن‌نیە . . !!

ئەو سەردەمەی کـــە مـــن ماموستایەتیم تیـــدا دەستپێ‌کرد خوێندن تێکرا بەزمانی عەرەبی بوو ، منالیش لە هـــەر تەمەنیکدا بووایە وەردەگیران ماوەی پینج سالّ لەوێ مامەوە لە دوواییدا تەمەنی منالّ بۆ وەرگرتنی کرا بە حەوت سالّ . لە پیشدا کچی وا هەبوو تەمەنی لـــە تەمەنی ماموستاکەی گەورەتربوو ـ کە هاتیتە شاری کۆیە لە هەولیرەوە هەستت چی‌بوو . ؟ کۆیە ئەوشارە خنجیلانە ئیـــك سووکە گەلی لەلای من دلگیرو نازدارو دلفرین بوو ، هەرچەندە گچکەو تەسك‌و ترووسك‌و بێ‌کارەباو بێ شەقامی فراوان‌و بێ خزمەت بوو ، لەگەلّ ئەوەشدا لەلای مـــن وەك باخچەیەکـــی رەنگـــین ئەینواندو دلی پەستراوو غەمگینی من کەوتە خۆشیەکی تایبەتیـــەوە ئەویش یەکەم جار بوو کە لە ژیانی شاری هەولیر دوور کەوتبوومەوەو سەربەستیم بە خۆمەوە دی با لە ژیر عەباو پیچەکەشدا بێ بۆ ئافرەت سەفەر کردن قەدەغە بوو ، منیش ماموستایەتیەکەم سەرفرازی کردم لەو هەموو قەدەغانەی لیم کرابوون .

( وادیارە ست رەمزیـــە ئەیەوی لەگەلّ خۆی من بەو ریگەیـــــەدا بەرێ ) ! ! .

یەکەم شت کە هەستی مرۆڤ ئەبزوینێ لە کاتی سەفەردا ئـــەو ریگاو بانەیە کە پێـــدا ئەڕواتو ئەیەوی بگاتە ئەو شوینەی کە بۆ یەکەم جار ئەیبینێ منیش ئەوەم هەر لەبەرچاوە کە ریگای هەولیر بۆکۆیـــە یەکیك بوو لەوخەونـــە سەوزانەی ئەماندیت کە گوایە دەبێ رۆژیك بیت ریگای هەولیرو کویـــە ببێتە یەك دوو سەعات . . ! ؟ کـــە جاران بێ ڕاوەستان لەچوار سەعات کەمتر نەبوو ئەمە لەهاویندا ، خۆ ئەگەر زستان بوایە ئەوە لە باران‌و بەفردا دەچەقین ، لە بیرمە کـــە جاریکی دوو ماموستای کچ خەلقی موصل بوون کە لەزستاندا لە ڕیگا مابوونەوە لەبەر بەفرو باران لەمالی موختاری دیکەلە نوستبوون .

ئەی ئیوە لەکوی ئەبـــوون لەکۆیە . . ؟

خۆمو دایکم کەلەگـــی‌و ئۆدەی مالیکمان گرتبوو ، گەلیکم پێ خۆش بوو کە بووم بەماموستاو لەشاریکی وەك کۆیە کەدیمەنە شیرینەکانی چیا ئەخشینە سەرکەشەکانی کوردستان ببینم .

بۆیەکەم جـــار ئازادی مرۆڤ لەگیانمدا جوولاو ئەو هەلالەو بۆنە خۆشەی کە لە گژو گیا کیویەکان‌و ئەو ئاوازە خوشـــانەی لە بولبول‌و قومری ســـەر دارەکان ئەهـــات هەستی ئەڤینی ئەبزوین هەستیکی تایبەتی بەشادی‌و بەختیاری .

کە لەقوتابخانە ئەگەڕاینەوە ئەو ماوەی دووایـــەت چۆن ئەبـــردە سەر .

ئەچووینە باغچەو کیلگە چەنـــد مالە ئاســـیاو وخۆشەویـــستمان ئەگەڕاین لەبەر ئەوەش کە شاری



کۆیە گچکەیە هاو ولاتیانی گەلـی خۆش رەفتارن‌و لەگەڵ غەریبـدا رێك دەکەون ، خۆشیان‌ویستین‌و تێکەڵ بەیەك بووین ، کاتی دەست بەتالیشمان بەنـەخش‌و نیگـار کێشان‌دە بردەسەر .

ئەو کێشـەو بەرەی دووچاری دەبووی ؟

لەبەر ئەوەی خۆم مامۆسـتای وەرزش بووم گەلیك لام گران بوو کە کەسوکاری قوتابیە کچەکان قایل بکەم بۆ ئەوەی بەشـداری لـە ( ئیستعراض )دا بکـەن چەندمان دەکرد کەسـوکاریان قایـل نەدەبوون .

بەگوێرەی وانەکان بەچی جۆرێك دابـەش دەکران بـە سـەر مامۆسـتاکان‌دا ئایاکـو بە پێی خویندن‌و شارەزایی‌یان یاخـود شتێکی تر بوو .. ؟

ئەو سەردەمەی ئیمە شارەزایی بەڵێ بەلام پسپوری لەمامۆستاین‌دا مەرج نەبوو بەلکوو داهێنـان‌و لێوەشاوەیی‌و شارەزایی پەیـدا کردن لەو مەودایەدا بناغـەی سەرکەوتن‌و رێز لینانی بور .

لەبەر ئەوە بەڕێوە بەری قوتابخانە خۆی بە ئارەزووی خۆی هەمـوو وانەکانی بەسـەر مامۆسـتاکان‌دا دابەش دەکرد ، بەلام بۆ من ئـەو وانەی بەرم‌کـەوت بە ئارەزووی خۆم نەبوو هەرچەندە ( بەڕێوەبەر وای بە باش ئەزانی ) . بەلام ئیستا ئەبینین کەوانەکان‌بەپێی توانـاو ئارەزوی مامۆستا کەوشارە زایەکی زانستیانە دابەش ئەکرێت‌و بـە شێوەیەکی دیموکراتیانـە وادیارە تائیسـتا هـەر لـە وا دیارە تا ئیستا هەر لـە خزمەتگوزاری خویندندایت .. بە زەردە خەنەیەکی لە خۆ رازی‌یەوە کە هەرچەندە جێی شانازی‌یە بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەفـین مامۆستا رەمزیە عادل ، سـەری لەقاند .

بۆ شێوەو جۆری وتنـەوەی وانەکان ئیستا چۆنـی ئەبینیت ؟

رەمزیە عادل کە یەکێکە لەیەکـە مامۆستا پێشـەنگەکانی فێر کردن کە بۆخۆی توانیویەتی لەقوتابخـانەی کوردستان‌دا لەهەولێر ئاقیکایەکی بچکولانە ئامادەبکات .

ئەڵێت : ئیستا وتنـەوەی وانەکان گەلێ ئاسان‌و رێك‌و پێـك بووە بەهۆی ئەو ئامرازو نەخشەو وێنەو شتومەکە جور بە جۆرانەی کە بۆ هەر وانەیەك بە تایبەتی لـە لایەن بەڕێوەبەریتی هۆی‌فێرکردنەوە ئامادە ئەکرێت جگە لەوەی کە هەیە مامۆستا خۆش ئەتوانی هەندیکـی دروست بکات .

هەر وەها بەڕێوەبەریتی پەروەردە هەندیك ئامرازو شتومەکی تاقیگا کە جاران شتی‌وا هەر نەبووە بەسەر قوتابخانەکاندا دابەش ئەکات سەر دەمی ئێمە ئەو شتەی کە ئیستا هەیە نەبوو ئەمایەوە سـەر تواناو لێوەشاوەیی مامۆستاکە ئەگـەر شتێکی ساکاری دروست بکردایە بۆ ئەوەی لەگەڵ وانەکەی پیشانی‌بدا .

ست رەمزیە لە بارەی نەهێشتنی نەخویندەواریی یەوە کە خـۆی لەیەکـە مامۆسـتای فێرکردن‌و نەهێشتن نـەخوینـدەواری ئەژمێردرێت ئەڵێت : بۆ یەکەم جار لە سەرەتای مامۆستایەتیم‌دا هەستم بە پێویسـتی ئەلەوەکەمان کرد کـە رزگاری بێت لە نەخوێنـدەواری‌و ئافرەت لەکۆتی نەفـای دەرچێت .

بەو هەستە پیرۆزەو بەوهاندان‌و هەوڵ دانەی کە تاکو ماوەیەك خۆی پێوە خەریك کردبوو بگرە وەکـو ئافرەتێکی لاوی تازە پێگەیشـتوو خۆی لەبیرچووبووەوە کـە ئەویش وەك ئافرەت رۆڵی لەژیاندا هـەر ئەوەنیە کە بۆ خویندن‌و فێرکردن تەرخانی کردوە ، بەلکـوو ئەویش داواکاری خۆی هەیە وەکو کچێکی هەرزەکار پێویستە ئاواتی و چێژی ژیانی کەمانێکی رەوای مروڤە بیکات .

ست رەمزیە لە کاتێکا ئەم گفتو گۆیانەی لەگەڵ من دەکرد تیشکی یادی کون‌و بەسەرچوونی لاوێتی‌و روژانی هەرزەکاری خـۆی بـە چاوەکانی‌دا تێپەر دەبوو هەسـتی بەشیمانی یەکی بەسۆز لەنێوانمان‌دا ئەوەستا .

ست رەمزیە هێشتا بەدڵێکـی گەرم‌و پڕ ئاواتەوە هەوڵی خزمەت کردنی خوێندەواری ئەدات‌و بـێ وچان کە هەموو کاتی خۆی پێوە خەریك کردوە ئنجا کە دێتەوە ماڵێ بە تەنیا لـە خانوە خنجیلەکەیی دا وەك مروڤێکی لە خـۆ رازی پاڵ ئەداتەوەو ئەحەسێتەوە هەست بە شانازی ئەکات کە بۆ ئەرکی خۆی خزمەت روژێکی بە فیڕۆ نەداوە .

رێزو سلاو بۆ رەمزیە عادل داوای هیزو تواناو تەندروستی بۆ کوتایی بۆ ئەکەین .

# زۆربوونی پەستانی چاوە «ئاوی پەش» ((Glaucoma))
# هۆیەکانی و چارەکردنی

زۆربوونی پەستانی چاو کە پێی دەگوترێ Glaucoma بریتی‌یە لە زۆربوونی پەستانی ناو چاو لە برێکی دیاری‌کراو وە بەشیوەیەکی کرداریانەش لەو کەسانەدا دەبینرێ کە تەمەنیان لە چل سالان تێپەڕیوە ، هەرچەندە جۆرێکی هەیە توشی منداڵان دەبێت و رەنگە ببێ بەهۆی کوێری ئەگەر زوو چارەسەری نەکرێ .

هەروەها دەکرێ بڵێین کە توشبوون بە زۆربوونی پەستانی چاو بەپێی رەگەز(توخم)دەگۆڕێ، هەروەک سەرنج دراوە ژن زیاتر توشی ئەو جۆرەیان دەبن کە هۆیەکەی نەزانراوە Congestive glaucoma . پەستانی چاویش بەرێژەی زانراو لەبەیانی و ئێواراندا جیاوازە ، جا ئەگەر ئەو جو دایی‌یە لە رێژەیەکی تایبەتی تێپەڕی ، دەتوانرێ بگوترێ ئەو کەسە دەشێ توشی نەخۆشی زۆربوونی پەستانی چلو بێت .

ئەم جیاوازی‌یە لە پەستانی خوێندا دەبی لە ٥ ملم جیوە رەت نەکات ئەگینا نەخۆش دەگونجێ توشی بەرزبوونەوەی پالەپەستۆی چاو ببێت .

دەتوانین بڵێین کە چارەی ئەم نەخۆشی‌یە بەیەکێ لەو رێگایانەی ژێرەوە دبێت :

١ ـ **چارەی سروشتی :** بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانی تایبەتی راگرتنی پەستانی چلو لەسنووری سروشتی ، ئەوەش حەب و مەرحەم (مەلحەم) (١) و دلۆپ و لەرێگای دەرزی لێدانەوە دەگرێتەوە کەدەبن بەهۆی کەم کردنەوەی پالەپەستۆی ناو چاو وەکو مانیفۆل manifol .

٢ ـ **چارە کردن بە نەشتەر گەری : کە بەهۆی** نەشتەر کاری جیا جیا دەکرێت کە دەکرێ بەهۆیەوە پالەپەستۆی ناو چاو کەم بکرێتەوەو گەلێ رێگای نەشتەر گەری هەیە کە بایەخی خۆی بۆ نەشتەرگەرەکان هەیە کە لەم بوارەی هەنوکەماندا پێویست بە درێژەپێدانی ناکات ـ بەڵام دەتوانرێ دەست‌نیشانی ئەوە بکرێ کە چەند نەشتەرکاری‌یەک هەیە کە پەنایان دەبرێنە بەر کاتێک کە چارەسەرکردنی پزیشکی سەری نەگرت ، هەروەها باری لەنەکاو هەیە پێویست بە نەشتەرگەری خێرا هەیە دوای زاڵ بوون بەسەر راگرتنی پالەپەستۆی ناو چاو کردارەکە بەخێرایی دەکرێ بەتایبەتی ئەمە لە دۆخە بەپەلەکان دەکرێ وەکو چۆن سووتانەوەی پەلەریخۆلە ( الزائدە الدودیە ) پێویستی بە دەست تێوەردانی نەشتەری خێرا هەیە بە مەبەستی رزگارکردنی ژیانی نەخۆش .

پەستانی سروشتی چاویش لەنێوان (١٥ـ٢٥ ملم) ی جیوەیە ، وشەی ئاوی رەشیش کە بە کاردەهێنرێ ناولێنانێکی هەڵەیە چونکە،ئەو شلەیەی لەناو چاو هەیە بێ‌رەنگە ، ئەم ناونانەش لە ناوی گریکی Buphthalmos ـ ەوە هاتووە کە بەباری منداڵانی ئەوتۆ دەگوترێ کە کاتێک دەبن توشی بەرزبوونەوەی پەستانی ناوەوەی چلو دەبن ، جا بۆیە چاو ، بەهۆی چوونە ژووری ئاوەوە بۆ ناو کۆڕینە Cornea ی چاو رەنگی دەگۆڕێ بۆ شینێکی تاریک کە بەم هۆیەش کوریە کە چیتر روون نابێتەو رێگای رۆیشتینی رووناکی نادا .

ئەم بەرز بوونەوەی پەستانی چاوەش دەبێتە هۆی خراپ بوونی چاو لەناوەوە بەتایبەتی تۆڕەو دەماری بینین و هەندێ جاریش ئەگەر چارەنەکرێ دەبێتە هۆی کوێری‌یەکی تەواو .

جۆرەکانی :

١ ـ **جۆری زگماکی** Congenital Glaucoma یاخود Buphthalmos ئەمەش کەم و کوڕی‌یەکی

رگەنی‌یە دەبێتە هۆی داخستنی ئەو کونانەی کە ...گەن بەو جۆگەلانەی ئاوی زیادی ناو چاو لە ریگایانەوە دەردەچێ .

گرنگترین نیشانەکانی ئەم جۆرەش ئەوەیە کە دایک تێبینی ئەوە دەکات کە منال لە رۆشنایی ئاسایی‌دا توانایی کردنەوەی چاوی نی‌یە ، هەروەها کۆرنیە تەماوی دەبێت ، لە دۆخە لی‌پێرکردووەکان چاو گەورەتر دەبێ بەتایبەتی کۆرنیە کە بەم بارە دەگوترێ Mega Cornea واتە کۆرنیەی مەزن ، ئەم جۆرەش چارەی بە نەشتەر دەکرێ ، ئەنجامی کردارەکەش بەندە لەسەر کاتی جێبەجێ کردنی ، ئەگەر زوو کرا بەر لەوەی ببێ بەهۆی بەرزبوونەوەی پەستانی چاو و لەدوایی‌دا خراپ کردنی ناوەوەی چاو ئەنجامەکە نەخۆشی‌یە .

**٢ ـ بەرزبوونەوەی پەستانی چاوی ناسەرەکی یان هۆزانراو : Secondary Glaucoma**

ئەم جۆرەش لە ئەنجامی یەکێك لەماکەکانی هەندێ نەخۆشی چاوەوە روودەدات وەك هەندێ هەوی کۆرنیە کە دەبێتە هۆی کون کردنی کۆرنیە .
Corneal ulcers and Fistula
هەروەها وەك سووتانەوەی کۆرنیە Iritis
و خوێن بەربوونی ناوەوەی چاو چارەی ئەم بارەش بەچارەی هۆیەکە دەبێ یەکەم ، وەدوای چاك بوونەوەی چاویش کردارێکی نەشتەری دەکرێ ئەگەر بالەپەستۆی ناو چاو هەر بەرز مابوو .

**٣ ـ جۆری هۆ نەزانراو : ئەمەش دوو جۆرە :**

**(أ) ئەو جەشنەی کە سووربوونەوەی چاوی لەگەڵدایە**
**Congestive Glaucoma**

کە ئاوسانی پێڵووەکانی لەگەڵدایە ، لەگەڵ سەر ئێشەیەکی زۆر بەتایبەتی لەناوچەی سەرەوەی گوێ ـ هەروەها بێ توانایی کردنەوەی چاو بەهۆی توندی ئێشەکەوە کە لەکردنەوەیەوە پەیدادەبێت ، هەروەاش کەم توانیستی لەبینین‌و بەرز بوونەوەی تربەی خوێن‌بەرو رەنگە پەستانیش لەناو چاودا لە ١٠٠ ملم جیوە زیاد بکات . ئەم جۆرەش لەچاوی بچکۆلانەی ئەموکۆدا پەیدا دەبێت کەتووشی دووربینی بووە Hypermetropia هەروەها خەڵکی بەدەمار (عصبی) زیاتر تووشی دەبن لەهی تر هەروەهاش ئافرەت زۆرتر تووش دەبن بەهۆی (انفعال) یانەوە . ئەم جۆرەش چارەی بەکرداری نەشتەری خێرا هەیە پاش راست کردنەوەی پەستانی خوێن ~~بەهۆی چارەکردن~~ چونکە وازلێ‌هێنانی‌و پشت گوێ خستنی کردارەکە لەوانەیە ببێ بەهۆی کوێری‌ی تەواو .

(ب) جۆری سادەی درێژخایەن :
**Chronic Simple Glaucoma**

ئەمەش بەشێوەیەکی ئاسایی لە بەساڵاچووانذا روودەدات کە لە(٥٠)ساڵی تێپەڕیون ئەم جۆرەش رەنگە جگە لە سەرئێشەیەکی سووکەڵەو کورت بینی‌یەکی لەسەرەخۆ ( کە کەسەکە واهەست دەکا ئەمانە هی‌پیرین ) چیتری لی وەدەر ناکەوێ . چارەی ئەم جۆرەش بە بەکارهێنانی دەرمانە دەبێ چ دلۆپ لەرێگای چاوەوە ، چ لەرێگای دەمەوە ، پەناش نابرێتە بەر کرداری نەشتەری تاکو دەرمانکاری پەکی نەکەوێ لەچارەکردن .

سەرچاوەی سوود لێ‌وەرگیراو : ـ

DAVIDSON,S PRINCIPLES AND PRAC— TICE OF MEDICINE , CHURCHILL LIVINGSTONE EDINBURGH LONDON AND NEWYORK 1977 TWELFTH EDITION

چاپی دوازدەمین ١٩٧٧ X

(١) مەرحەم (هەتوان) پشی‌پێ‌دەووترێ .

(*) گۆڤاری (بانگەواز) [illegible]

ئازاد مصطفی محمود ئامادەی کردووە *
پۆلی سێیەمی کۆلێجی پزیشکی
زانکۆی بەغدا

# خوارووی ئەفریقا

کۆماری خوارووی ئەفەریقا ، وڵاتـی ئاڵۆزی و پڕ ..ەترسی و دژواری ، . ئەویش لە ئەنجامـی دەست تی وەردانی ئیمپریالیزم لە خاك و کاروباری ژیان و .... هتد .

کەوشەنی ئەم وڵاتە و دانیشتوانی : ـ

ئۆقیانووسی هینـدی دەکـەوێتە ڕۆژ هـەڵات و باشووریەوە ، بیابانی کلهاری ، بیابانی نامیبیا لە باکور و ئۆقیانووسی ئەتلأنتیك لای ڕۆژ ئاوا یەوەیە .

زەویەکەی پێوانەیەکی پانو بەرینی گرتووە تەوە کە ـ ٢٣٠ر٢٢٤ر١ کیلۆ حەتری چوار گۆشە ،

یاخود دوو ئەوەندەی پێوانەی فەرەنسایە . بـە پێی سەر ژمێری یەکەی سـاڵی ١٩٧٠ ، نزیکـەی ( ٢٣٠ر٤٤٧ر٢١) کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بەش کرابوون

[ سـپی پێسـتەکان ٧١٦ر٧٥٠ر٣ ، بانتو ٥٥٩ر٥٧٠ر١٥ ، ئاسیاویە کان ٤٢٢ر٦٢٠ ، کۆچ کەرو پەنابەر و ... هـ ـ تێکەڵاو ـ ٥٣٣ر١٨٠ر٢ ] ملیۆن کەس دەژین .

ئەم هەرێمە لە بارەتی ئاو و هەواوە دەکەوێتە بەر کار تی‌کردنی دەریا ، بەڵام ئـەم کار تێ‌کردنـی دەریایەش بە پێی ناوچە دەگۆڕێ. لە لایەکەوە دەبینین بەفر بەدرێژایی ساڵ شاخە بەرزەکانی (کایا و ناتاڵ)ی داپۆشیوە ، کەچی کەناری ئۆقیانووسی هینـدی و دەشتەکانی ناتاڵ گەرم و شێ دارنا . ژیانی زووربەی دانیشتوانی ژیانێکی خێڵەکی یە ، چونکە داگیر کەران ماوەی خوێندەواری و بەرز بوونەوەی پایەی زانیاری نەداون .

زمانی سەرەکی و نەتەوەیی دانیشتوانی ئەم وڵاتە ئینگلیزی یە ، دووەم زمانی دانیشتوان ئەفریکانی یـە بەپێی سەر ژمێری یەکەی ٩٧٠ ی میری ئەوێ ٦٥٪ ی پێی دەدوێن ، تایبەت شاری کاپ و زیاتر لە سپی پیستە کان . بیرو باوەری ئاینیان جیاوازە ، ئاینی سەر بە کلێسەی بویری هۆلەندی و ئاینی ـ الانجلیکانیە ـ و ئاینی ـ المیتودیە ـ لەم ناوانەدا هەن .

لەم وڵاتەدا (١٦) دانیشگا هەیە ، کە (١٢)ە یان تەرخان کراوون بە تەنیا ، بۆ خوێندنی سپی پێستن داگیر کەر .

لە ساڵی ١٩١٠ ە وەساڵی دروست بوونی [ یەك گرتوەکانی خوارووی ئەفەریقا ] وڵات لە چوار ناوچە پێك هات ، کاپ یان ـ رآس الرجاء الصالح ـ و ناتاڵ نیشتمانی رەسەنی خێڵـەکانی زوولو و ئـورانج ی سەربەست و ترنسڤاڵ ، . گەورەترین شارەکانی وڵات جوهانسبرج ( دەوڵەمەند ترین خاك بە کانی ئاڵتون لە جیهاندا ) ، کاپ و پریتوریا و دربان .

دوای کشانەوە و هاتنە دەرەوەی خـوارووی ئەفەریقا لە کۆمەڵی دەوڵەتانی ـ الکومنولث ـ ساڵی



ـ ١٩٦١ ـ و بوونی بە کۆمارێکی سەر بەخۆ، سەرۆکی دەوڵەت ، دەسەڵاتی راپەراندن تەنیا بە رەمز و ووتە کارو باری وڵاتیان دایە دەست . ، بۆیە دەڵێین رەمزی چونکە بی پرس و تەگبیر لە گەڵ کردنی سەرۆکی وەزیران و ئەنجومەنیا بەردێکی بۆ ناخرێتە سەر بەردێکی تر !! .. ئەوان لە لایەن لیژنەیەکی هەڵبژاردنەوە کە لەئەندامانی پەرلەمان پێك دێن بۆ ماوەی ـ ٧ ساڵ ـ هەڵیان دەبژێرن .

ئەندامانی پەرلەمان یش کارو باری دەسەڵاتی یاسادانان یان گرتۆتە ئەستۆ کە پێك دێ لە کۆمەڵەی نیشتمانی و ئەنجومەنی پیران . هەڵبژاردنی تاکەکانی کە ژمارەیان ـ ١٥٦ ـ کەسن و بۆ پێنج ساڵ فەرمانیان بەرێ دەکەن لە لایەن کۆمەڵێ لە دەنگدەران کە هەموویان سپی پێستن لە خوارووی ئەفەریقا و ( نامیبیا ) هەڵدەبژێرێن .

نامیبیا زەوت کراوو و داگیرکراوەی ئەڵمانیا بوو ، بەر لە داگیر کردنی لە لایەن سوپای خوارووی ئەفەریقاوە ساڵی ـ ١٩١٥ ـ . لەگەڵ ئەو هەموو داواکاری و نارەزاییانەی کۆمەڵەی وڵاتە یەکگرتوەکان دایان ، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو و تا ئەمرۆش هەر لە ژێر رکێفی حوکمی داگیر کەری دایە . یاسای گشتی وڵات یاسای رۆمان و هۆڵندی ساڵی ـ ١٨٠٦ ـ لەگەڵ هەندێ زێدەیی و دەسکارێ کردنی لەسەر بنەڕەتی بەریتانی ـ بویر ـ یاخود کشتیارە هۆڵندی یەکان ساڵی ـ ١٦٢ ـ نیشتەجێ‌ی

[ سەری لوتکەی هیوا ] رآس الرجاء الصالح ـ بوون . دوای چەند ساڵێك کۆچ و باریان تێك نلو بە وێڵی لەوەڕگاو جێ پاوەن .

داخزانە بەشی باکووری وڵات . تا ساڵانی نیوەی دووەمی سەددەی هەژدە یش چ هێزوو دەسەتێکی ئەوتۆ پەیدا نەبوو بو کە شەرو هەرایان لە گەڵدا بکەنو و جێو شوێنیان پێ لێژ بکات . بگرە ئەووان چەند خێڵ و خێزانێکی ـ هوتنتوت ـ کە دانیشتوانی سەرەکی وڵات بوون سەرکوت و لەناو بردن . بەڵام ئەمەیان تا سەر نەخوارد . چونکە چەند خێڵێکی بەهێز و رێك و پیکی یەکگرتوی ـبانتوـ یان لێ پەیدا بوون کە ئەوانیش لە دەور و بەری ڕووباری ـ جریت فیش ـ بە دوای لەوەڕگا و خاکی بەپیتی کشت و کاڵی دا ئەگەڕان بۆ درێژی هەشتا ساڵ کوشتن و کوشتار و تالانیو ماڵ وێرانی یەکتری لە بەینیان دا دروست بوو تا سووپای ناپلیون و هێزی دەریایی ئینگلیزی سەری لوتکەی هیوا یان لە هۆڵندی یە کان ساندوو



ئامادەکردنی

حسن محمود رسول

پاش ماوەیەکی کورت کردیانە داگیر کراوەی ئینگلیز و حکومەتێکی تایبەت بە خۆیانیان دروست کرد . لەو ڕۆژەوە وڵات کرا بەو چوار ناوچەیەوە کە باسمان لێوە کرد . دۆزینەوەی کانە ئاڵتونەکانی ناوچەی جوهانسبرگ ساڵی ١٨٨٦ وڵاتی تێك وەرداو باڵی مەترسی و ئاڵۆزی دژواری کێشا بەسەر ژیانی خەڵکی ئەوێ دا ، باری ئابووری و کۆمەڵایەتی تێك چوو ، وە بووە هۆی ڕوودانی شەڕی گەورەی (١٨٩٩ـ١٩٠٢)ی بەینی بویر و ئینگلیز و سەرکەوتنی ئینگلیز تیای دا و پێك هێنانی خوارووی ئەفەریقای یەکگرتو ساڵی ١٩١٠ .

جیاواز کردنی ڕەگەزایەتیەکی زەق : ـ

تیئوریکی لاهوتی بەد کەلای زۆربەی ـ ئەفریکان ـ یەکان هەیە ، کە گوایە خوا لەسەر ڕەش پێستەکانی نووسیوە [کە دار ببڕنەوە و ئاو هەڵێجن] ئەم ووتەیە لە باری ڕامیاری یەوە دوو سیمای ئاشکرای پێوە دیارە : یەکەم بیرکی سەرکەوتنی ڕەگەزی سپی پێست . دووەم بەرێککردنی ناکۆکی ڕەگەزایەتی — Apartheid — . ڕەشەکان مانی دەنگدان و خۆنیشان دان و مافی کارکردن لە بازرگانی یەت دا نیانە بە هیچ کلۆجێ ، وە بۆیان نی‌یە کەئیش‌و کارو بارو کاسبی سەربەخۆبکەن ، وە لە کارو کرداری ئیداری ( کرداری خۆکرد ) و کاری هونەری ئەتوانن بچنە یەکێتی یەکانیانەوە بە مەرجی پەیمان ببەستن بۆ ڕازی بوونیان بە جیاکاری ڕەگەزایەتی تەواو .

پێست ڕەشەکان کە دانیشتوانی ئەسلی ئەو خاك و وڵاتەن بێ بەشن لە چوونیان بۆ زۆربەی شوێنە گشتی‌یەکان وەك (سینەما و، چایخانەو شانۆ و گەرماو و ئۆتێل و باخچە گشتی‌یەکان و ...) وە بۆیان نی‌یە کەسوود لە زۆربەی پێویستیەکانی ڕۆژانەی ژیانی مەردم بکەن ، بۆ نموونە ئوتوموبێلچیەکانی گواستنەوە، شەمەندەفەر و پاپۆڕەکانی گواستنەوە ، ئوتومبێلی نیسماف ، تاکسی هاتو چۆ .... و هتد ) .

ساڵی ١٩٧٣ نرخی ٩٧٩٣٩٦ کیلۆ گرام ئاڵتونی دەر هێنراو لەلایەن سپی پێستی داگیر کەر لە ناوچەکانی ترنسڤال و ئورانج بە تەنها ٧٧٪ی بەرهەمی ئاڵتونی دەر هێنراوی جیهان بووە ، ئەڵماس ی ڕووت هەر لەو ساڵەدا ٧٥٣٤٣٠٠ قیراط بووە ئەمانە جگە لە کانە بەنرخەکانی یۆرانیوم و خەڵوزی بەردوو فۆسفات و نوحاس .

(٦٤٨٠٠٠)کەس لەو جۆرە پیشەسازیانەی ناو براو لە ناو کان و کارگەکانی دا ئیش ئەکەن کە ـ (٦٣٥٠٠) کەسیان لە سپی پێستەکانن . پیشەسازی ڕاوەماسی دەریا یەکێکە لە جم و جوولە گرنگەکانی کەناز دەریای بەشی ڕۆژئاوا و خوارووی وڵات ساڵی ٩٧٥ (٢٠٤٢١٦٩٠ تەن ) ڕاو کرابوو ، کشت و کاڵی لە برەوی و پێشکەوتن دایە بە تایبەتی لەو ناوچانەی باراناوی بەپیتن ، یەکەم وڵاتی جیهانە لە ناردنە دەرەوەی هەمە جۆری شەراب ، لەبەر زۆری درەختی مێوو و سێو تییایدا .

بەڵام ئەم وڵاتە فراوان و بەخێر و بێر و نەخشینە ، تا ئەمڕۆش نەخۆش مێردەزمەی ڕەگەز پەرستی و دەست تێ وەردانی ئیمپریالیزم و نۆکەرایەتی . وەنەبێ زایۆینزمی بەد جنسی و دەستی چەپەڵی ئیمپریالیزمی داگیر کەر لە خاکی زەوت کراوی پرتەقاڵ و زەیتون خاکی پیرۆزی فەلەستین هیچ کەمتر بێ لە ڕەگەز پەرستانی خوارووی ئەفەریقا ، چونکە سەهێونی ڕەگەز پەرستو دروست کراوەی‌ئیمپریالیزم بەد ڕەگەز پەرستانی خوارووی ئەفەریقا ، و هەر هەمان کارو فرمانی پێیان سپێردراوە بۆ ئاغاکانیان دەبینن . بەڵام نابێ هەرگیز ڕەش بین بین چونکە جەماوەری گەلی فەلەستین و خوارووی ـ ئەفەریقا ، لاوانی جلیل و قودس و حیفا و ... ڕەش پێستەکانی بانتۆ و زولۆ و .... خوێنی شەهیدانیان بەفیرۆ نادەن .






محمد عبد الجبار ساڵەیی

**شتێکی زۆر سەیرو چاوەڕێ نەکـــراو لـــە ڕۆشنبیرو هونەرمەندە هونەر دۆستانی جیهان کـە ناوی وێنە کێشی هۆڵەندی «ڤینسێنت ڤان گۆخ» یان نەبیستبێ‌و هیچی لـــە بـــارەوە نـــەزانــــن ؟**

دەشێت ناوبانگی هونەرمەند « ڤان گوخ » وەکو ئەفسانەیەکی هونەری هاوچەرخو هونەرمەنـــــدی ڕەسەن ناخۆشی ژیانی کورتی‌و ئەو کۆمەڵە نامانە بێت کە بۆ « تیۆ » ی برا بچوکی ڕەوانە دەکرد ، کە خۆیان لە پێنج سەد نامە یەك دەدەن . چونکـــە جگە لـــە وێنەکێشێکی بەسەلیقە نوسەرێکی زۆر بـــە تواناو کارامەبوو. نامەکانی بە گشتی خەزینەیەکن لە هەستی بەرزی مرۆڤایەتی‌و بیری جوانو بە نرخ . ئەمانەو جگە لە تابلۆ نایابەکانی کە ڕێگەیەکی زۆر مرۆڤایەتین لـــە دەربڕین « التعبیر » و بەکار هێنانی بۆیەو پەرەموو‌چە. هونەرمەند « ڤان گوخ » لە ساڵی ١٨٣٥ لە گوندی « کرۆت زۆندەرت » ی کەم ماڵە لە وولاتی هۆڵەندە.. و ولاتی « ڤرێمێر » و «ڕامبرانت» لە باوکێکی قەشەی پرۆتستانتی و دایکێکی خانەدانی ژێر هاتۆتە ڕووی جیهانەوە . « گوخ » هەر لـــە منـــداڵیەوە ژیانـــی دەوروپشتی‌و سروشتی گونـــدەکـــەی ســـەرنجی ڕادەکێشاو لە دوورەوە دەیڕوانیە ژیانی دانیشتوانی گوندەکەی ، هەمیشە حەزی بەتەنیایی و گۆشەگیری بوو بەدەگمەن هاوبەشی‌ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی‌دەکرد وەباخود لەگەڵ تێبۆر«تیۆ»ی برا بچووکی‌هەڵدەبستاو باسی کەساسی‌و ئازارو ئەشکەنجەکانی خۆی بـــۆ دەکردو ئاواتەکانی خۆی بۆ دەووت . « ڤان گوخ » پاش خوێندنێکی کورت لە ساڵی ١٨٦٩ لە تەمەنـــی شازدە ساڵیدا چووە شاری « لاهای » بۆ کارکردن لە کۆگایەکی بازرگانی تایبەت بـــە فرۆشتنی تابلـــۆو پاشماوەی هونەریی . پاشان بۆ لقەکانی هەمان کۆگا نێردرا بۆ شاری برۆکسۆڵو لەندەن . لە سایەی ئەم کارانەدا « گوخ » وەك هەڵێکی ڕەخساو بە پەرۆشەوە کتێبە هونەری یەکانی دەخواستەو دە خوێندنـــەوە مێشکی خۆی پێ زاخاو دەدا . زۆر جاریش هـــامو شۆی پێشانگاو مۆزەخانەکانی دەکردو ساتو دووسات لە تابلۆکانی « رامبرانت » و « فرانسوا مێللیە » ورد دەبووەوەو دیقەتی دەدان ، وەلە دواییشدا هەر بـــە مامۆستاو ڕابەری ڕاستەقینەیی خۆی دادەنان .

« ڤان گوخ » پاش وازهێنانی لە پیشەی مامۆستایی‌و وانە ووتنەوە لە شاری « ڕامسگێت » ی ئینگلیزی بڕیاری دا ببێتە قەشەو ڕێی باوکـــی بگرێـــتو هەژارەکان بلاوێنێتەوە و ئارامی و دلنیایی‌یان پـــێ ببەخشێت کە ئەوەش ئاواتی کـــۆنو هەمیشەیـــی خێزانەکەی بوو چونکە لەو سەردەمەدا هەستی ئایینی زۆر بلاوبووەوەو تەشەنەی سەند بوو . ڕەنگە هۆی ئەوەش هەژاری بارو زرووفی ئابووری ئەو ناوچانە بێت کە تێی‌دا قەشەو وەعز دادەر بوە . هەر وەکو لە شاری بۆریناجی بەلجیکی لە نێوان کرێکارانـــی ژێر زەوێ ئەو شارە دەبینین وەك ئاین پەروەرێكو خاوەن ویژدانێك بە هانای ئەوانەوە هاتووەو بە دەمی برسی‌و لاکەو تەکانیانەوە چووەو موچەو کـــەلو پەلەکانی بۆ تەرخا نکردوون . هەر لەبەر ئەم هۆیانەش بوو لە پایەکەی خۆی دەرکرا بەو بیانوەی کە ئایینی مەسیحی ئاینێکی بێ‌گەردە دەبێت پیاوی پاکو پۆشتە هاتوو چۆی کڵێساو جێگە ئاینیە پیرۆزەکانی بکات نەك ئەو رووتەڵانە چونکە شایستەی ئەوەنین . لەدواییشدا «گوخ» ژیانی برسیەکانی ئەو شارە لـــە تابلـــۆی « بیرەوەریەکانی باشوور » وەکو بابەتێکی ڕەسەن لە بۆیەی تەڵخو تاریك دەربڕی .

« لەگەڵ ئەوەشدا توانای هیچ شتێکم نی‌یـــە هەست بە بوونی خۆم دەکەمو ئەتوانم ببمە مرۆڤێکی دی‌کە ... بەلام چۆن وە بۆچی ئەتوانم بەسوود بەو خزمەت بکەم » « ڤان گوخ » زۆر کات ئەم ڕستانەی دووبارە دەکردەوەو باسی بێ‌توانایی‌و سەرنەکەوتوویی خۆی دەکرد . لەبەرئەوەی هەرچی کارێكو ئیشێکی دەکرد ڕەزامەندی خۆی تیا بەدی نەدەکرد . زۆربەی ئەم هۆیانەو گەلێکی ناڕاستەو خۆی تریش هاندەری ڕاستەقینەو تەواوتی « گوخ » بوون بۆ ڕوون کردنەوە

هونەری وێنەکێشان لە تەمەنی بیستوحەوت ساڵیدا، بە مەبەستی توانەوەو ئاگادار بوون لە ژیانی خەڵكو هاوبەشی کردنی ئازارەکانیان لە ڕێی هونەرەوە نەك ئایین . وە هەروەها دەربڕینی بیرە حەشار دراوەکانی مێشکیو حەسانەوەی دەروونی خۆی. جا هەر بۆیەش تابلۆکانی وەکو ئاوتنەیەك دەخستە کار بۆ ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕاستەقینەیی پڕ لە ئەشکەنجەو مەینەتی هەژارەکان . هەر وەکو دەبینین خۆی لە دوانامەیدا دەڵێت : « تابلۆکانم بەر هەمی قوربانیدانن لە ژیاندا چونکە نیوەی ئەقڵم بۆ سەرف کردووون ». بەڕاستی وێنەکێشان تەنها پیشەیەك بوو بۆ «گوخ» کە تیایدا تامەزرۆیی خۆی پێدەردەکردو ویژدانی خۆی پێ دەحەساندەوەو مایە دڵنیاییو چێژ لێ وەرگرتنی بوو . بەڕادەیەکی وا لە بەیانی زووەوە تاکو نیوە شەو وێنەی جوتیارو دار بڕو شوانەکانی گوندەکەی دەکرد پاشانیش دەیگوا ستنەوە سەر تابلۆ تەنانەت لە ڕۆژێکدا زیاد لە تابلۆیەك کاری دەکرد وەکو تابلۆی ( جۆلا ) و ( جوتیارو کێڵەگەکەی ) و ( دەغلیگەنم ) و گەلێکی تریش لەو بابەتانە . تابلۆی « پەتاتە خۆرەکان » بە یەکێك لە جوانترین و ناو بانگترین بەر هەمە هونەریەکانی دادەنرێت کە تیایدا خێزانێکی جوتیار دەستیان ناوەتە خوانی پەتاتەوەو بەری ماندوو بوونو ئارەق ڕشتنی خۆیان لە پەتاتە دەخۆن کەبەڕێکەیەکی زۆر سەر بەرزانە بە دەستیان هێناوە هەروەك «گوخ» خۆی دەیگوت . ماوە ژیانی هونەرمەند لەفەرەنسادا کە دوو ساڵ بوو « ١٨٨٦ ـ ١٨٨٨ » بەگرنگترین قۆناغی ژیانی هونەریی دادەنرێت کە تیایدا زرنگیو بلیمەتیەکەی نشوونمای کردو پەرەی سەندو ڕووبەڕووی قوتابخانەی کارتێکراوی « التأثیریە ، الانطباعیە ، اکسپرشنزم » بوەوەو بێ سێو دوو لەگەڵ هونەر مەندانی ئەو قوتابخانەیە ڕێکەوت . لە پێشاندا بەڕێبازێکی زۆر هەڵچوانەو دواکەوتوویی لەژێر کاریگەری قوتابخانەی هۆڵەندیو هونەرمەندانی پێشووی هۆڵەندە کاری دەکرد بە پێچەوانەی ئەم قۆناغە کە بە ووشکی هێمن دەناسرێت ئەمەش لەکارێکەری هونەرمەندە ڕۆشنبیرو قوتابخانە جۆراو جۆرە هونەریەکانی فەرەنسی دەزانرێت . هەروەها نەخشو نیگاری ژاپۆنیەکانیش جۆرە لایەنگریەکو ڕێبازێکی هوونەریی لە بیری کۆمەڵایەتیو دۆزینەوەی بۆیەی تەنكو کاڵ پێبەخشی .

«گوخ» تەنانەت پاش دوور کەوتنەوەش لە هۆڵەندە برسیەکانیووڵاتەکەی لەیاد نەدەکرد وەهیچ کاتێکیش پەیڕەوی ڕێبازی ئەکادیمیایی نەدەکردو هەتا مردیش بە «ڤینسێنتی هۆڵەندی» مایەوەو کاریگەری سروشتی هۆڵەندیو کەلەپووری نەتەوایەتی زۆربەی تابلۆکانی گرتۆتەوە . هونەرمەند « ڤان گوخ » بۆ بابەتەکانی بێ پەروا لە ڕەنگە تیژەکان دەگەرا بە تایبەتی ڕەنگی زەردو شین لەبەر ئەوە زۆر جار وێنەی گولە بەرۆژەی دەکێشا یاخود بە شێوەی هێڵ هێڵ لە دەمو چاوی مۆدیلەکانیدا بەکاری دەهێنا کە ئەمەش هەڵچوویو بڵاویو لێك بچراوی دەروونی خۆیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ، یان هەروەك خۆی دەیگوت « زۆربەی پەتاتە خواردن ئەو ڕەنگە زەعفەرانیەی بە دەم چاوی هەژارەکان بەخشیوە نەك من » . دەبێ ئەوە بزانین کە تیشکی بەتینی ڕۆژ تەنها هیوای هونەرمەند بوو چونکە هەردەم دوباتی دەکردەوەو دەیگوت « من عەودالی تیشکی خۆرێکم کە هەموو بەشێك لە گیانم بسوتێنێت تەنها ئارەزووی وێنە کێشانم نەبێت » . بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٨٨٨ دا لەسەر ڕێنمایی هونەرمەند « تۆلۆز لۆترێك » ی هاوڕێی خۆی گەیاندە شاری (ئارل) کە دەکەوێتە باشووری فەرەنسە لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست . گوخ گەشە هونەرییەکەی لە شاری ( ئارل ) کۆتایی پێهاتو تەواو بوو لە هونەرمەندێکی سەرەتاییەوە توانی بگاتە لوتکە . ئیتر پەرەموچەکانی بە ئارەزووی خۆی هەڵدە سوڕان بە ئاسانی کاری پێ دەکردن بەبێ هیچ ئاڵۆزیەكو وەستانێك ، لە چەند ساتێکی کەمدا تابلۆیەکی بەپێزی دەهێنایە کایەوە ( ڕۆلانی پۆستەچی ) و ( چایخانەیەك لە شەودا ) و ( ئافرەتێك لە ئارل ) و چەند دانەیەکی تریش لە تابلۆ نایابەکانی ئەم شارەن .

« تابلۆکانم دەنگی هاوارێکی ناسۆرییەو لە ناخی دەروونمەوە دەردەچێت » بەم ڕستە کورتو پڕ مانایە هونەرمەند « ڤان گوخ » وەسفی بابەتی تابلۆکانی دەداتەوەو بۆمانی دەردەخات تا چ مەودایەك لە دەربڕینی مرۆڤایەتی بۆ بزواندنی سۆزو ویژدانی تەماشاکەران سەرکەوتوو بوەو چۆن ژیانێکی تراژیدیایی لە چوار چێوەی تابلۆیەکدا پێشان داوەو دەری بڕیوە . ئێمە لە لای خۆمانەوە دەتوانین ئەم

بابەتانە بە شۆڕشێك و خاوەنەكەی بە شۆڕشگێڕێك بدەینە قەڵەم چونكە ڕەسم كردنی ئەو جۆرە بابەتانە شوورەیی‌و ئابڕوو چونێكی بێ وێنەبوو لەلای هونەرمەندە كلاسیكی‌یەكان .

هونەرمەند « ڤان گوخ » هەمیشەبەیەكێك لە ڕابەرو مامۆستاكانی قوتابخانەی دەربڕین « التعبیریە » لە هونەری تازەدا هەر چەندە هەندێك لە ڕەخنەگرانی هونەری‌ی سەرپێچی ئەم قسەیە دەكەن بەڵام ئەوە ڕاستی‌یەكەو ناتوانرێ پێ‌شێك بكرێت كە تاقە وێنەكێشێكە دیمەنەكانی ژیانی بە جوانترین مانای كۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتی دەر بڕیوەو گیانێكی زیندووی خستۆتە بەری بابەتەكانیەوە . بە جۆرە هەستێكی وا وێنەی جووتێ پێڵاو دەكێشێت كە هەر دەڵێیت دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی یەكترن ، یان ئەو گوڵەگەنم‌و دارسنەو بەرانەی كە لەسەر تابلۆكانی دەشنێنەوەو بەم لاو ئەولادا دێن . بۆ نموونە پێ‌یەكانی (كورسی)یە بەناوبانگەكەی دەتوانین بە دوو پێ‌ی وەستاوی مرۆڤی بێنینە پێش چاو . ئەگەر بەم جۆرە بچینە خەیاڵەوەو پارچەی نێو تابلۆكانی بشوبهێنین ڕەنگە پەتاتەكانی بە بەچكە پشیلەو قەدی دارەكان بە پاڵی مرۆڤ‌و پەنجەرەی ماڵەكانیشی بە چاو لێك بدەینەوە . ئەمانە هیچی شتێكی گاڵتە بابەت‌و كاریكاتێر نین بەڵكو هەر یەكێكیان بە شێكن لە نەفسیەتی « گوخ » خۆی كە بە چری‌یەكی زۆر خۆیان دەنوێنن . ئەم چری‌و ئاڵۆزی‌یە لە هەستی قوڵی‌و سۆزی بە تینی‌و كەسایەتی شكاوی وەكو خۆی هەستی دەكرد ــ دەدوێن ، تابلۆكانی ساڵانی دوایی ژیانی ڕاستی ئەم قسانەمان دەسەلمێنن ، چوونكە بە جۆرە تیژی‌و گەرمیەك دەردەكەون بەتایبەتی دارو دەوەنەكانی كەهەر دەڵی‌ی دەسوتێن‌و گری بڵێسەیان بەئاسماندادەچێت . بەگشتی دەساڵ ماوەیەكی زۆر كورتە بۆ بەرهەم هێنانی ئەو تابلۆ بە پێزانە كەشان لەشانی شاكارە مەزنەكانی مێژووی هونەر دەدەن بۆ پیاوێكی سەرەتایی وەك «گوخ» . هەرچەندە بەلێهاتووی‌و زرنگی خۆی هونەرەكەی لە چرۆیەكی سیس‌و لاوازەوە گەیاندە گوڵێكی گەش لەسایەی كێشەو زۆرانبازیەكی بێ‌شوومار و درێژ لەگەڵ سەركەوتن‌و كە اوتكە وەكو دەبینین توانی سەركەوتن و زاڵ بوونی خۆی بە هەموو جیهان ڕابگەیەنێت بەرامبەر بە قوربانی دان و نشوستیەكی زۆر لە ژیاندا . «گوخ» هەروەكو زانیمان لە میانەی تەمەنی كورتی دا گەلێك ناخۆشی‌و برسێتی‌و كارەساتی جەرگ بڕی بینیوەو چەند جار بە برسێتی و گیرفان بەتاڵی هەڵی كردوە بەچەشنێكی وا لەبەر نە بوونی‌ی كەوچك بەفلچەكانی نانی دەخوارد .

سەر باری هەموو ئەمانە نەخۆشی «فێ» كە كردبویە جێ‌ی گومانی هاوڕێكانی‌و هەمیشە چاوەڕێ‌ی هەڵچونێكی ترسناكی لێ دەكرا . چونكە جارێكیان گەیاندیە ئەوەی تاكێك لەگوێچكەی خۆی ببرێت و بیكاتە خەڵاتی ژنێك لە قاوغە شقارتەیەكدا لە جیاتی قەرزێكی كۆن بە هیوای چاك بونەوەو ڕزگار بوون لەو دەردە پیسە دوستی جار چوەتە نەخۆشخانەی مێشك « الاعصاب » و چەند مانگ تیای ماوەتەوە . دوا دەرچوونی لەنەخۆشخانەی مێشك وەكو جارانی پێشوو ئاسایی نەبوو بەڵكو بە جۆر هەستێكی تاریك بینانەو لێڵایی سەرچاوەوە دەرچوو . بەو بڕوایەی كە كۆڵێكی گرانی سەر شانی كۆمەڵەكەیەتی بەتایبەتی «تێوی» برای چونكە ژیانی ڕۆژانەی بۆ دابین كردبوو وە مۆچەی بۆ بڕیبوەوە . دەشێت خۆكوشتن باشترین ڕێگەبێت ــ وەكو گوخ خۆی بۆی دەچوو ــ بۆ ڕزگار بوون لەو ژیانە چەپەڵەو كۆتایی بهێنێت بە تاقی‌كردنەوە سەر نەكەو توەكەی وەكو خۆی دەیگوت . ئیتر بۆ دواجار لە بیست و پێنجی تەمموزی ساڵی ۱۸۹۰ لە سەر گردێك تابلۆی « قەلەڕەش‌و دەغڵی گە نم » دەكێشێت ، دیارە ئەو باڵندە بەشووم و نەگبەتانە لە خۆشی كۆتایی هاتنی ژیانی «گوخ» دەفڕێنن‌و ئاسمانی تابلۆ تاریك‌و تە لخەكەی لێ دەگرن . یەكسەر پاش كۆتایی هاتنی تابلۆكە بە دوو گولە خۆی پێكاو لە ۲ی تەمووزی ساڵی ۱۸۹۰ لەتەمەنی سی‌و حەوت ساڵێدا لە باوەشی تیۆی برای‌و نێوان تابلۆو هاوڕێكانی پالی سپارد ئەو گیان ودلەی كە لە ژیانیشدا لەلا ی‌هەژارەكان بو نەك خۆی

## سەرچاوەكان


(۱) حول فن الحدیث . نوسین جورج فلانجان .
(۲) حیاة ڤان كوخ (دووبەرگ نوسینی ارفنج ستول
(۳) من رواد الفن الحدیث . نوسینی د. نعیم عطیە

**هەتا ئێستە ـ نایشزانین تا کەی هەروا دەروا ـ موفرادەداتو زاراوەی زمانی کـــوردی بە تـــەواوی کۆنەکراونەتەوەو لە ناو ( فەرهەنگی زمانی کوردی )دا یەکانگیر نەبوون .**

واتە هێشتا زمانی کوردی لە فەرهەنگی کوردی دەوڵەمەندترەو فەرهەنگەکانی بەردەستمان سەرمایەی تەواوی زمانەکە نینو بەشێکی ئەم سامانە بەنرخە لە کەلێنو کونو قوژبن پێچو پەنادا تۆزو خۆڵی بەسەرا بارەوو خەریکە لەبیر بچێتەوە . ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە زۆرمان لـــە کیس چـــووەو تـــازە هیـــوای زیندووبوونەوەیان نەماوە .

هەر کوردێك ماوەیەکی باش لە گوندەکانـــی کوردستانـــدا ژیابێتو تێکڵاوی ژیانـــی ڕۆژانـــەی خەڵکەکەیان بووبێتو ، ئێستە دانیشێ هەندێك بـــە وردی بیر لە موفرەداتی زاراوەو کەرەسەی : جووتو بەرەو ، خەلەو خەرمانو ، شەتڵ لێدانو ، گەڵارووتەو، هەریتلێدانو ، خانووکردنو گلێبانو ، مازووچنینو ، ... تاد کە ئێستە مـــەکینـــەی جـــووت جێگەی گرتوونەوەو جووتیار ناوی پارچەکانی مەکینە فێر بووەو ئەمانەی لە بیرچووەتەوە . هەروەها : سوالەو ، مەڵۆو ، تابەو ، شاراو ، ڕەنو ، خەرمانو ، گێرەو ، قرچو ، وەردو ، پەڕەوناوو ، بەیکەو سوورو ، شەنو سێلكو ... دەیان شتی کە مەکینەی دوەو هەمووی ناونەتە ئەولاوە . هەر بەم پێیە گەلێ لایەنو بارەی کەیش ...

جا کە ئەمان زانیو ئەم کەلێنە گەورەمان دیاری کرد ، دەزانین هەر کارێـــك بۆ ژیانـــدنـــەوەو زیندووکردنەوەی موفرەداتو زاراوەی کوردی بکرێت کارێکی پیرۆزەو خاوەنەکەی جێگەی ڕێزو شـــیاوی قەدرگرتنە .

کە لەم چاوەوە سەیری کارەکەی کاك مەحموود زامـــــدار دەکەین کە کتێبی **(فەرهەنگی لفظو لوی)ای** کاك **( حەمیدی ئیزەد پەناه )** ی لەگەڵ لەهجـــەی کرمانجی خواروودا بۆ بەراورد کردووینو **( کۆڕی**

# چەند پەراوێزێک

**تەونو جۆلایو** ... دەیان کارو فرمانی کەی خەڵکی کوردستان بکاتەوە کە هەر یەکەیان دەیان کەرەسەو زاراوەو موفرەداتی هەیەو ئـــەم ناوو زاراوانـــەیش گەلێکیان لە لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەیەکی کە ـ کەم تا زۆر ـ گۆڕانیان بەسەردا دێتو دوورو نزیکییان لە یەکەوە هەیە .. یەکێك بێت دانیشێ بـــیر لەمانـــە بکاتەوەو جارجاریش سەرێکی فەرهەنگەکـــان بـــداو لاپەڕەکانیـــان بگـــەڕێ گەلـــێ ووشـــەی وای بـــە بـــیردا دێـــت هێشـــتا لەو فەرهەنگانەدا جێگەیان نەبووەتـــەوەو لەوانەیشە فریای زۆریان نەکەوینو بە یەکجاری لەناو بچن . بە تایبەتی کە ئێستە لە گەلێ بارەوە ئاڵو گۆڕی گەورە لە کایەدایـــەو زۆر لـــەو شتانـــە بۆ یەکجـــاری دەبێچرێنەوەو ڕەنگە لە مۆزخانەکانیشدا جێگەیـــان نەبێتەوە . وەك دەیان ئامرازو کەرەسەی جـــووتو بەرەو خەلەو خەرمان لە : هەوجارو دەسەکەوشەو ، مژانو ، هەیەو گاینجەو ، ژێرە زوانەو ، وێژان‌بەرەو

**زانیاری کورد )** یش چاپی کردووەو پێشکەشـــی خوێندەوارانی کورد کراوە .. دەبێ کارەکە بە کارێکی پیرۆز بزانینو ئافەرینی کاك مەحموود کەین بۆ ئـــەم هەوڵەیو داوای ئەوە بکەین وێنەی زۆر بێ .

من پێش ئەم کتێبەی کاك مـــەحموود ئـــەم فەرهەنگەم نەدیوەو ناوم نەبیستووە ، کاك محموود ئەم سەرچاوە بە نرخەی زمانـــی کوردی خســـتە بەردەستمان . هەر ئەوەندە بڵاوبووەوەو دەستم پێی گەیشت شانم کرد بە خوێندنەوەیداو هەندێك بە وردی خوێندمەوە . لە ئەنجامدا گەلێ سەرنجم دەربارەی کارەکەی کاك مەحموود هەبوو وا لێرەدا ، بە گوێرەی دەرفەت ، هەندێکیان تۆمار دەکەم . بەڵام دەبێ لـــە پێشدا ئەوە بڵێم : کاری فەرهەنگ نووسی کارێکی ئاسان نیەو ، بەزەلامی تاقە باڵ هەڵناسێو ، لە زۆر لە وڵاتانی جیهاندا چەند شارەزاو پسپۆڕ لە نووسینی یەك فەرهەنگدا بەشدار دەبنو ، کاتو دەرامـــەتو سەرچاوەو هەموو پێویستیەکانیشیان لەگەڵ ڕێزدا بۆ

# «فەرهەنگی لك و لوڕ»

● محمد علی قەرەداغی ●

ئامادە دەکرێت. جا کە کاك مەحموود بە تەنیا خۆی ئەم کارەی کردووە بێگومان بە هەموو لایەکیدا نەگەیوەو ناتەواوی هەیە .

**بەلام جێگەی داخ ئەوەیە ناتەواوییەکان گەلێ زۆرن و لەوانە بوو بە هەولێکی کەم و پیشاندانی چەند شارەزایە رادەیان زۆر نزم بوایەتەوە .**

بە هەر حاڵ . من بە هیوای یارمەتیدان و خزمەتکردنی ئەم مەبەستە پیرۆزە سەرنجەکانم لەم بارەیەوە دەردەبڕم . داخی ئەوەیشم ناچێ کە ناتەواوییەکان لەوە زۆرترن وتاریکی وا بیانگرێتەوە ، بۆیە بەشیان دەکەم و (تەنها نموونە) یان بۆ دەهێنمەوە.

**هەلە لە هێنانی هاو واتادا :**

گەلێ جار کاك مەحموود لە دوای یەك کەلیمەی **( لوڕی )** بەوە چەند کەلیمە بە هاومانا و هاوواتا دەنووسێت . ئەمە ئەگەر هەموو ئەو موفرەدانە هاوواتاو هاومانای کەلیمە **( لوڕی )** یەکە بن ئیشتیکی زۆر بە نرخەو بەلگەی دەوڵەمەندی و بەرفراوانی زمانی کوردیە . بەلام ئەگەر ماناکانیان جیاجیا بن و شیاوی ئەو جێگە نەبن ئەوە مەبەست پێچەوانە دەبێتەوەو زیان زۆرتر دەبێ . گەلێ جار کاك مەحموود لێرەدا سەرنەکەوتووەو وشەی دژواتای زۆرکردووە . وەك :

**١ ـ ( پەرچگردە : پەرچ کردن . پینە کردن . بزمار ریژ کردن ـ . پهن کردن یکسر میخی کە از تخته یا آهنی عبور کردەاست ل : ٤٥ )** . لەو سێ مانای کاك مە حموود هێناونی تەنها یەکەمیان ، بە هەندێك دەستکاریشەوە ، راستە . واتە « پەرچاندنەوە»ی سەری بزماری دەرچوو ... ئیتر (پینەکردن)و ( بزمار ریژ کردن ) جێگەیان لایەکی کەیە .

**٢ ـ ( ٢ ـ سەرزەیە : سەرتاشین . راکردن . سەرکێشی کردن ـ فرار کردن سرکشی کردن . ل : ١١٦ )** لێرەدا ( سەرتاشین ) ناجۆرە .

**٣ ـ ( قولاچ : قولانج . مست ـ . واحد اندازەگیری است و آن فاصله دو انگشت ابهام و سبابه است وقتیکه کاملا باز شوند . ل ١٤٣ ) .**

ئاشکرایە مست و مشتەکۆلە زۆر لە قولانج جیاوازن .

**٤ ـ گەرتگر : گەردوو . دێراو . گەتوو ـ . وسیله ای کە باغبان با آن زمین را کرتبندی میکنند . ١٥١ )** . زۆر روونە کە (گەتوو)و (دێراو) لە یەك جیان و (گەتوو) دێراوی پێ هەلدەدرێ .

**٥ ـ ( گەرگە : فرۆ . گەرە . ژەکی کولاو . جمگە ـ . شیر ماك گاو یا میش یا بز وقتی جوشیده شور میزنند و لخته میشود ل : ١٥٢ )** خۆ (گەرە)و (فرۆ)یش جیاوازیان لەوەدا نییە پێویستی روون کردنەوە بێ .

**٦ ـ ( گەرکیت : مافوور . گەرکیت ـ . شانەی قالی بافی کە بان تارو پودرا میگیرد . ل : ١٥٢ )** لێرەشدا هەر ( گەرکیت = کەلکیت ) راستەو گونجاوە ، چونکە مافوور لە کوێ و کەلکیت لە کوێ !

کەلکیت ئەو ئامرازەیە تەون‌کەران دوای تێ‌لکێشان و چنینی چەند تالێك لە تەونەکە بەو کەلکیتە ئەیکوتنەوە بۆ ئەوەی جێگەی خۆیان بگرن و مافوورەکە سفت و جوان بێ .

**٧ ـ گزگە : نانبەروو گزگل ـ . نانی کە از ارد بلوط تهیە میشود . ل ١٥٤ ) . (نانبەروو)و** (گزگل) زۆر دوورن لەیەکەوە .. نان یان (گێتکە)ی بەروو جۆرە نانێکە . لە ناچاریدا کاتی گرانی بەروویان برژاندووەو هاڕیوانەو لەگەل ئاردی هەرزن تێکلاویان کردووەو کردوویانە بە نان و لە سەخلەتی گرانی دەربازی کردوون . بەلام (گزگل) بەرێکە لە بەرەکانی داری مازوو ، بە تەڕی سەوزە ، بە وشکی توێکلەکەی رەنگی قاوەیی‌یەو ناوەکەی زەردە، ئەکوترێ و بۆ دەرمانی جەدەوی‌ی و برینی پشتی کەر بەکار دەهێنرێت .

**٨ ـ ( گونج سورخه : زەنگە زیرە . زەنگـــە سۆرە ـ . نوعی زنبوراست قرمز رنگو درشتاست. ل : ١٦٩ )** . زەردەواڵە . یـــان زەنگـــــــە ســـووره . یـــان شـــــــەنگە ســـوره سیره مۆزە ، یان زەردەواڵە سوورد . ئەمانە هەموویان یەك جۆر زەردەواڵەن و ئەو زەردەواڵەیە کە بە (لوڕی) پێی دەڵێن : ( گنوج سورخە ) . کە زەردەواڵەیەکی سووری زلە . وەك فارسیەکە روونی کردووەتەوە . بەڵام زەنگە زیرە ، یان زەردە زیرە ، یان زەردەواڵـــــە زەردە . جۆرێکی کەیـــەو ، ئەوەیـــە بە (لـــوڕی) (گونجزەردە)ی بۆ دانراوەو تێکلاوکردنیان راست نیە .

بۆ ئەم مەبەستە ئەوەندە نموونە بەسە . بەڵام ئەوەیش هەیە جاری وا هەیە کەلیمە **(لوڕی)یەکـــە** چەند مانا هەڵدەگرێو کاك حەمیدی ئێزەد پەناهیش بۆی نووسیوە بەڵام کاك زامدار تەنهـــا یەکێکیانـــی نووسیوە . وەك :

**١ ـ ( کیپل : کێر ـ . پیمانەایست کە ظرفیت ان پنج مناست . الت تناسلی مرد . ل : ١٦١ ) .** ئەمە هەر مانای دوومی کراوە . مانای یەکـــەم کـــە پێوانەیەکە (پێنجمەنە) وەك بڵێی تەغار ، یان ربە ، یان وەزنە ... ئەو مانایە نەنووسراوە .

**٢ ـ ( گالش : دەفری پیالە . پای افزاری کە از لاستیك ساختەشدە ، قاب اســـتکان . ل ١٦٢ )** لێرەشدا مانای یەکەم کە (کالە)یـــەو بۆ جێکەکـــە گونجاوترە نەنووسراوە .

**نەزانینی مانای کەلیمەکان :**

کاك محمود زامدار لەگەل جێکـــەدا مانـــای کەلیمەکانی نە زانیوەو بە هەڵەدا چووە وەك :

**١ ـ ( پەلی : کەنار . لا ـ . پهلو . نزد . کنار. ل : ٤٨ )** مانای پەلی بۆ (پەراسوو) لە هەردوو ماناکەی دیکە گونجاوترەو ( پەلی = پالوو = پەراسوو ) کاك مەحموود خۆی دوای یەك دێڕ وای مانا دەکات . کاتێ دەڵێ : **( پەلی کەواو : کەبابی پەراسوو . پەراسووی برژاو . )**

**٢ ـ پلیلە : پەلوولەی ناردو گەنم ـ . مخلوطی از آبو آرد گندم دانە دانە میکنند برای جوجە مرغی کە تازە از تخم بـــیرون امدە اســـت . ل : ٤٨ )** ئەوەی شیاوی فارسیەکەیەو بۆ خۆراکی جوجکـــەی تازە لە هێلکەجووقاو ئەگونجێ (پڕپۆلە) یە .

**٣ ـ ( تاپو : چاڵە گەنم ـ. مخزنی استوانەمانندااست کە از گل درست شدەو برای نگهداری گندم یا آرد و مانند آن مورد استفادەاست ل : ٥٢ )**

ئەمە زۆر روونە کە مەبەست (کەنوو)ە نـــەك ( چاڵەگەنم ) .

**٤ ـ ( تیری ی : تێرك تێر ـ . حلقە طنابی کـــە بگردن گوسالەو بزغالە میبندند . ل : ٥٥)** زور روونە کە ( تێرك = توو بەرە ، خورج ... ) ناکرێتە ملی کارو گوێرەکە . بەڵکوو ئەوەی ئەکرێتە ملی گوێرەکە پێی دەوترێ : ( گولوێنك ) . وە ئەوەی ئەکرێتە ملی کارو بەرخ پەتێکە ـ بە مەرجێك بە مێخنەکەوە بێت ـ پێی دەووترێ : (رك) .

**٥ ـ ( تەك : سەبەتە ـ . ظرفی است کە از ساقەء گندم درست میکنند . ل ٥٧ ) .** (تەك) هەندێك لە مانای سەبەتەوە دوورەو مەبەست لە تەك (تەیکەیە) کە سینییەکە لە سرووت چنراوە . هەروا تەبەقـو پلاوپاڵێویشی پێ دەوترێ. بەڵام پلاوپاڵێو لە شووڵی بلالووكو قەرەقاج دروست دەکرێ . سەبەتە بۆ ترێو هەنجیرو هەڵووژەو شتی وا بەکار دێت .

**٦ ـ ( توشە : توێشەبەرە ـ . زاد و رحلە غذائی کە برای سافرت درست میکنند ل : ٥٩ )** توێشەبەرە بۆ ئەم مانا ناگونجێو تەنها (توێشە)ی بۆ دەشـــێ ، چونکە توێشەبەرە ئەو چارەکەو دەفرو شتەیە کـــە توێشەی سەفەری تێدەکرێ .

**٧ ـ ( چەپیش : کارژۆلە ـ . بزغالەء پنج ماهە تا یکسالو نیم ل : ٧٠ )** ئەمەیش لێرەدا (گیسك)ی بۆ دەووترێ نەك (کارژۆلە) ، چونکی بەچکەی بزن تا چوار پێنج مانگ بچکۆلەیە ، بەڵام لەو تەمەنە بەرەوژوور گەورە ئەبێو گۆشتی خۆش ئەبێو چەقۆودانی لـێ تیژ دەکرێتەوەو ناوی گیسکی لێ دەنرێ .

**نەزانینی مانای هاوواتا :**

گەلێ جاریش کەلیمەیوا هەیە هاوواتاکەی لە کرمانجی خوارووودا دەست دەکەوێ بێ سەرئێشەیەکی ئەوتۆ . بەڵام کاك زامدار پەیی پێ ناباو هەندێ جار دووچاری هەڵە دەبێت ، ئەگەر هەڵەیش نەکات بـە شەرحو مانایەکی زۆر ئەوسا ئەگاتە مەبەست ، کەچی ئەگەر هاوواتاکە بێت بە یەك کەلیمە دووسێ دێڕ یان زیاتر ئەپێچرێتەوە وەك :

**١ ـ ( ئالاکو : جـــۆرە ئامرازێکـــی ئاسنینی دەسکدارە کە بۆ بژارکردن بەکار دێت ـ . وسیلەایکە از اهن درست شدەاستو دستەچوبی داردو با آن وجین میکنندو علفهای هرزەرا از زراعت برمیکنند**

ل : ٢٤ ) . لێرەدا ئەگەر یەکسەر بنیوسیایە پاچ کە (ناوکەن) و ( پاچەکۆلە)ی پێ دەکرێ پڕ بە پێست دەردەچوو . دەبێ ئەویش بزانین هەر بۆ ئەم مەبەستە ئامرازێکی کەیش هەیە پێی دەڵێن : (مەساسە) ، هەرچەند هەندێ جێگە ئەم ناوە بۆ ( هێشەماڵە ) یش بەکار دێنن .

**٢ ـ ( برالیك : داری هەلوژەی شاخی . درخت آلبالوی کوهی ل : ٣٦ )** ئەمە یەك تۆزی گۆڕان بەسەردا هاتووە . ( برالیك = بلاَلووك ) ئیتر ( داری هەلووژەی شاخی ) چی ؟ دەیشتوانی تەماشای لاپەڕە (٢٠٦)ی هەمان فەرهەنگ بکەیت کە دەڵێ : **( هەلونە : بەلاَلووك . آلبالو وحشی‌استو نام درخت آن (برالیك)است)** .

**٣ ـ ( بووپیرە : مێردی دایك ـ . شوهر مادر. ل : ٤٠ )** لێرەشدا باوەپیارە جوانترەو پەندە کوردییەکەشمان بیردەکەوێتەوە کە دەڵێ : ( دایك بوو بە بلوەژن باوکیش ئەبێ بە « باوەپیاوە » .

**٤ ـ ( پەروار : پەروار ـ . گوسفند یا گاوی را کە برای چاقشدن می بندند ل : ٤٥ )** ئەگەر لە دوای (پەروار)ەوە (دابەستە)و (دانی) بنووسرایە روونتر دەبوو .

**به هەڵە چوون لە لێکدانەوەی فارسییەکەدا :**

گەلێ جاریش کاك مەحموود مانای فارسییەکەی نەپێکاوەو هەڵەی لە لێکدانەوەدا کردووەو مەبەستی (لوڕی)یەکەی وون کردووە .

وەك :

**١ ـ ( نۆزیرکە : دووڕوو . ئاوری بن‌کا ـ آب زیر کاه ل : ٢٩ )** دیارە لێرەدا مانای فارسییەکە **(ئاوی ژێر کا )** بە نەك (ئلوری ژێر کا) ، تۆ بڵێی (ر)ای (ئاوری) بە هەڵەی چاپ نەگەیێتتە ئێرە !

**٢ ـ ( بەچ بەچەزا : بەچەزا. کوڕەزا. کچەزا. فرزندفرزنــدزادە . نبیرە ل : ٣٤ )** ئەمە لێرەدا (کوڕەزازا)یە نەك (کوڕەزا) . (کوڕەزا) لە (ل : ٣٥) دایە .

**٣ ـ ( برار : برادەر . هاوڕێ ـ . برادر (١) ل : ٣٦ )** لێرەداو لە دوای ئەمیشەوە لە (برارزا) لێی تێکچووە کە (برادر)ی فارسی (برا)ی کوردییە .

**٤ ـ ( پوشت : قوون . قنگ . کون ـ . عقب . کنایە از برادر هم است ل : ٤٦ )** ئەمەش هەر زۆر روونە کە (پشت)ی مەبەستەو (پشتو پەنا )و ( تیرەو پشت ) زۆر زۆرەو ( برا لە پشت برایێ مەگەر قەزا لە لای خودا بێ ) . ( ئەم فلانە بە چوار پشت ئەگاتەوە سەر فلان ) . هەروا ( عقب )یش بۆ نەوەو تیرە بەکار دێتو دەووترێ : ( الابتر : من لا عقب لە . ( ای لا ولد لە ) .

**٥ ـ ( چەختو : کەسێکە مووی بەری زۆر بێ ـ. کسیکە موی زهــار او زیاد بلنــداست ل : ٧١ )** ئەمەیش راستیەکەی : ( کەسێکە مووی بەری زۆر ( درێژ ) بێت ) .

**٦ ـ ( گوڕواسە : ڕێوی کێویلە ـ . گربەکوهی ل : ١٦٥ )** دیارە لێرەیشدا لێی تێکچووە . راستیەکەی (پشیلەی‌کێوی)یە نەك ( ڕێوی کێویلە ) .

**هەڵەی چاپ :**

لەگەڵێ جێگەیشدا هەڵەی چاپ هەیەو لە کۆتاییدا راست نەکراوەتەوەو باسی نەکراوە . هەڵەی چاپیش لە هەر جێگەکدا خراپ بێو زیان بەخش بێ لە فەرهەنگدا زیادەی چەندقاتە ، چونکە فەرهەنگ راستەوخۆ پەیوەندی بە زمانەوە هەیەو بچووکترین گۆڕین لــە هــەر ووشــەیەکــدا ڕێگــەی زمــان خوار ئــەکــاتو دەنگــەکــە بە ناڕاستی دەردەچێ . نموونەی گوێ‌نەدان بە هەڵەی چاپ یان خەمساردی لە چارەسەرکردینا لێرەدا دیارە:

١ ـ پێنج دێڕی ل : ٨٢ ـ لە دێڕی ١٧ وە تا ٢١ ـ لە ل : ٨٣ دا دووبارە نووسراوەتەوەو باسیشی نەکراوەو ، بێگومان لەو جێگەدا دێڕێك کەوتووە ئەگەر پێنج دێڕیشی نەبێ .

٢ ـ لە ل : ١١٧دا ژمارە بۆ پەراوێزێك دانراوە بەلاَم پەراوێز هیچ نەنووسراوە .

٣ ـ لە پەراوێزی ل : ١٢٦دا دێڕێك یان زیاتر کەوتووە .

٤ ـ لە ل : ١٣٢ یشدا ژمارەی پەراوێزێك هەیە بێ ئەوە پەراوێزەکە نووسرابێ .

٥ ـ لە ل : ١٧٣دا ، دێڕی حەوت ، ( نجانەای ) نووسراوە راستیەکەی ( بخانەای ) ە . هەر لــەو لاپەڕەیــەدا لــە دێڕی (١١)دا (تبندی) نووسراوەو (بتندی) راستە .

کۆتایی سەرنجەکانم بە چەند پرسیارێك دێنم کە خۆم وەلاَمی تەواویان نازانمو بە هیوام وەلاَمیان بزانمو زانینی وەلاَمیان پەیوەندی بە هەوڵی کاك ( حەمیدی ئێزەد پەناه ) و کاك (مەحموود زامدار )ەوە هەیە :

ئایا کاك ( حەمیدی ئێزد پەناه ) بە باشــــی لەهجەی (لوڕی)ی زانیـوە ؟ چ ڕێنووســـێکی لـــە نووسینەوەی بەشی (لوڕی)یەکـــەدا بەکار هێناوە ؟ دەنگەکانی چۆن دەربڕیوەو نیشانەکانی لامی قەڵەوو لامی ســـــووكو (واو)و (ی)ی تیژو کراوەی چـــۆن نووسیوە ؟ دوایی کاك مەحموود چۆن ئەو فەرهەنگەی نووسیوەتەوە ؟ دەســـکاری ڕێنوسەکـــەی کـــاك حەمیدی کردووە یان نە ؟ ئەگەر کردوویەتی چۆنـــی زانیوە ؟ بەهەر حاڵ شارەزایانی لەهجەی لوڕی ئەتوانن ئەم پرسیارانە روون بکەنەوەو زیاتر خزمەت بە زمانو فەرهەنگی زمانی کوردی بکەن .

لێرەدا گومانم لە دوو نموونە دەردەبڕم :

**١ ـ ( سیر : بووکێنی ـ ٠ عروسی ل : ١٢١ ) ٠**

**( نیر : رووناکـی ٠ نـــوور ـ ٠ نـــور ل : ١٩٤ ) ٠**

من وا دەزانم (ێ)ی (سیر)و (نیر) بە تەواوی بـــە (ی) ناخوێنێتەوەو بەڵکوو لە بەینی (واو)و (ی)دا ، واتە بە (ئیماله) دەخوێنرێتەوەو ئەو کاتە کەلیمەکان وەك (سویر)و (نویر) دەخوێنرێنەوە . ئەوەش دەڵێم گەلێ جار لە گوێ کوانوو بەر زۆپای شەوانی زستاندا بیستوومە پرسیار کراوە ئەمە چییە : ( «سوور» بـــە «لەکی» شاییە ) ؟

٢ ـ وێنەی (بیبه) لە (**چارگوش بیبه ل : ٦٨**)دا مانای (ماضی) دەگەیەنێ نەك مانای مەصدەر واتە : ( چوار گوێ بووە ، گوێ قولاخبووە ) نەك ( گـــوێ هەڵخستن ) . واتە ئەسلی (ی)ی (بیبه) (و) ە ( بیبە = بووە ) ئەم بوونی (و) بە (ی)ە لە زمانی کوردیدا زۆرەو نموونەی فرەیە . ماموستا ( حەسەنی قزلجی ) ش لەم مەبەستە دواوە دا (١) .

**پەراوێز :**

(١) بڕوانە : حەسەنی قزلجی ، گۆڕانی پیتەکان بەیەکتر ، جێگۆڕکێی پیتەکانو سوانو تێکشکانـــی وشەکان بە هۆی ئەو ئالو گۆڕانەی بەسەر پیتەکاندا دێ . گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد . بەرگی شەشەم . ١٩٧٨ . چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد . بەغدا ل : ١٥٨ .

# چەند تیۆرێك دەربارەی ( بێ ئارامی )

« کریم سۆفی »

ئەگەر لە روانگەیەکی جیهانی‌یەوە بڕوانینە باری گوزەرانی مرۆڤ ئەبینین ملیۆنەها کەس دووچـــاری دەردێکی پەنهانو **شاراوە بوونە** کە بۆتە هـــــۆی هەراسان کردنو پشوو **لێ‌هەڵگرتنیانو** تێکدانـــی بەختەوەری ژیانیان ، ئەم **تێکدەرە « بێ ئارامی » یـــە** کە بە یەکەم دوژمنی مرۆڤ ئەدرێتە قەڵـــەم ، زۆر تیۆری جۆر بە جۆر دەربارەی دروست بوونی ئەم بێ ئارامی‌یە هەیە . پزیشکەکان ئەیگەڕێنەوە بۆ چەنـــد **نەخۆشی‌یەکی ئۆرگانی** ، وەیاخود لە ئەنجامی خەیاڵو خەیاڵ بازێتی کە سایەتی ئەم بێ ئارامی‌یە دروســـت ئەبێت . **زۆر جار مرۆڤ خۆی بەر پرسیارە لە دروست بوونی بێ ئارامی** ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو بیرکردنەوە ئەندێشەیی‌یەی کە مێشكو لێکدانەوەی خۆی پێـوە خەریك ئەکاتو بە شتێکی راستەقینەشی ئەزانێت کەچی لە راستی‌دا بیر کردنەوەیەکی خەیاڵی‌یەو بەس **هیچ بناغەیەکی مەنتیقیو زانستی پاڵپشتی ناکات.**

بابزانین زانا سایکۆلۆجیستەکان لەم بارەیـــەوە **چۆن لە بێ ئارامی گەیشتوونو بەچی‌یـــان داوەتـــە قەڵـــەم .**

**« بێ‌ئارامی » : ـ دۆخی ترسێکی شاراوە تونـدو تیژە کە ئەبێتە هۆی دڵ تەنگیو خەمو خەفەتو ئێشو ئـــازار**

**کەسی بێ‌ئارام هەمیشە بیر لە ڕوودانی شـــەر ئەکاتەوە ، هەرگیز رەش‌بینەو گومان هەموو شتێکی دەورو بەری ئەکاتو لەوە ئەترسی کە زیانێکی پـــێ بکـــات .**

**سایکلوجیستی**

**دەروون ئەمی** بە ناوبانگ « فروید » **بێ‌ئارامی ئەکاتە دوو بەشی سەرەکی : ـ** .

١ ـ بێئارامی بابەتی ـ القلق الموضوعی ـ : کە بەرپەچ دانەوەی مەترسی غەریزەی ناوەوەی ناسراوە، مەترسی بابەتی ... مەترسییەکی ناسراوە ، بێ ئارامی بابەتی بێئارامی یەکە **لە دەوری مەترسییەکی ناسراو ئەسوڕێتەوە .**

٢ ـ بێئارامی دەمارەکی ـ القلق العصابی ـ ئە کە بەرپەچ دانەوەی مەترسی ناوەوەی نەناسراوە بێئارامی دەمارەکی بێئارامی یەکە کە **لە دەوری مەترسی یەکی نەناسراو ئەسوڕێتەوە** ، ئەم جۆرەیان ئەکرێتە چەند لقێکی تر کە ئێرەدا بواری باسکردنیان نییە .

لە سەرەتاوە « فروید » سووربووە لەسەر ئەوەی کە **گوایە** پەیوەندی‌یەکی بەتین هەیە لە نێوان دروست بوونی بێئارامی‌و بێ بەش‌بوون لە «سێکسی» هەروەکو ئەلی : ـ

« زۆربەی ئەو کەسانەی کە **تووشی بێ بەش بوون لە سێکس هاتوون ، بێگومان تووشی (بێئارامی) یش هاتوون »**

کەواتە بەپێی تێگەیشتنی پێمەوانەی ئەم دەستەواژیە ئەتوانین بلێین هەر مرۆڤێک کە دووچاری بێئارامی بووە هەروەها دووچاری بێبەش‌بوون لە (سێکس) یش بووە . لۆجیکێکی سەیرە ئەگەر بە گوێرەی ئەم لۆجیکە بێت کەواتە بۆمان ئەلوێت بلێین :

« مادام هەموو گوێزێك خڕە کەواتە هەموو خڕێك گوێزە » ئەمەش وابزانم ئەگەر هەر لە ئەرهەنگی بیرکردنەوەی « فروید » جێگای ببێتەوە کە هەموو جۆرە ئەخۆشی‌یەك‌و ئارەزوویەك ئەداتە پاڵ بێبەش بوون لە سێکس **ئەمەش ئەقڵ پاپشتی ناکات،**

«فروید» لەسەر ئەم پێوو دانگە ئەیەوێت مرۆڤ شی بکاتەوەو لێکی بداتەوە هەروەکو مرۆڤ بەگشتی بە گیانلەبەرێکی سێکسی ئەزانێ‌و دەوری هەموو لایەنەکانی تری ژیان فەرامۆش ئەکاتو ئەیەوێت لە سەرکەرت « الجزء » گشت « الکل » شی بکاتەوە .

« فروید » ئەلی : « کاتێ کە ئالوودەی سێکس ڕێگایەکی ئاسایی ناگرێتەبەر بۆ بەتاڵ بوونو تێربوون **ئەم هێزە ئەوسی‌یەی کە بەستراوەتەوە بە پاڵپێوەنەری سێکس «اللیبدو»** ئەگوڕێت بۆ بێئارامی **«القلق»** ئەم **گۆڕانەش بەلای** فروید بەرێگایەکی فسیولۆجی ئەبێت، کەچی فروید لە بیردۆزەکەی دوایی‌دا لەم بارەیەوە ئەم رایەی خۆی پووچەڵ ئەکاتەوەو ئەمجارەیان بە پێچەوانەوە بۆی دائەبەزێت ئەلێ ئە

«بێئارامی ئەبێتە هۆی بێبەش بوون لە سێکس » . هەرچۆنێك بێت رەنگە زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی‌کە دووچاری بێ ئارامی هاتوون لەوانەبن کە ڕێگایەکی ئاسایی‌یان هەبێت **بۆ بەتاڵ کردنو تێرکردنی ئالوودەی سێکس** . واتە ئەتوانین بلێین مەسەلەی بێبەش بوون لە سێکس هۆیەکی بنچینەیی نیە بۆ دروست بوونی بێئارامی .

لە بیر دۆزەکەی «توارانك»دا دەربارەی دروست بوونی بێئارامی واهاتووە : **«گوایە لە دایك بوون ئەبێتە هۆی بێئارامی ئەو بی ئارامی‌یەی کە « رانك » پێی** ئەلێ « بێئارامی‌یەکەم » هەروەها ئەم بێئارامی‌یە لە دوایی‌دا بەردەوام ئەبێت **بە بەردەوام بوونی کەسەکە .** اتورانك ئەلێ : ـ جیابوونەوە لە دایك ( مەبەست لە دایك‌بوون ) ە ئەبێتە هۆی دروست بوونی بێئارامی بەلگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە کە گوایە ژیانی ناو منداڵدان سەبارەت بە **مناڵ** وەکو ژیانی بەهەشت وایە کە مناڵەکە هەست بە چێژو بەختەوەری‌و خۆش گوزەرانی‌یەکی بێپایان ئەکات،بەڵام لەدایک بوون بریتەیە لەدەرکردنی لەم بەهەشتە خۆشەدا . بۆیە لە دایك بوون ئەبێتە هۆی دروست بوونی بێئارامی .

لێرەدا ئەبینین ( فروید ) بە رایەکەی « رانك » رازی نی‌یەو رەخنەی لێ ئەگرێت ، گوایە مناڵ لە سەرەتای ژیانیدا فامکردنی نیەو‌نازانێ کەوا لە دایکی‌جیائەبێتەوە یاخود جیا بۆتەوە بۆیە « فروید » ئەلی : جیابوونەوە لە دایك هۆیەکی بنەڕەتی‌و سەرەکی نیە بۆ دروست بوونی بێئارامی بەڵام « فروید » لەو بڕوایە دایە کە ئەم ئێش‌و ئازارەی بە لەشی مناڵە (مەلۆتکە) کە ئەگات لە ئەنجامی جیابوونەوەی لە دایکی ئەمەیە هۆی سەرەکی دروست بوونی بێئارامی لە دایك بوون .

« لێرەدا مافی ئەوەمان هەیە کە بلێین **مادامەکی** مەلۆتکەی ساوا گە هەستو ئەستو فامی نیە چۆن هەستو فامی بەو ئێش‌و **ئازارەیەکرد** کە لە ئەنجامی لە دایك بوونیدا دووچاری هاتووە .. !

لە لایەکی تر خۆ ئەم مناڵە مەلوتکەیە هێشتا ئەگەیشتۆتە قونافی فامکردن‌و تێگەیشتن هەتا بیرۆکەو لێکدانەوەی خۆی بەم **ئێش‌و ئازارە ناخۆشەیە خەریك بکات** ... لەوانەیە ئەم ڕایە زیاتر بە **سەر ئاقرەتەوە ڕایەکەدا جێگای خۆی بگرێت** ، چونکە ئەو لە ئەنجامی ئەم مناڵ بوونەیەوە هەستی بە ناخۆشی‌و ئێش‌وئازاری

لەشی‌و دەروونی کردووە »

ئەبینین ـ فرۆید ـ هەر زوو ئەگەڕێتەوە سەر رایەکەی ـ رانك و ـ دان بەوەدا ئەنێ‌و بایەخێکی گرنگ ئەداتە جیابوونەوە لە دایك کە هۆیەکی گرنگە بۆ دروست‌بوونی بێ‌ئارامی منالّ بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە دایکی لی‌وون ئەبێت بەڵام ئەم جۆرە بێ‌ئارامی‌یەی کە منالّ ئەو کاتە هەستی پێ‌ئەکات بەرای ـ فرۆید ـ **ئەگەڕێتەوە بۆ هەست کردنی منالّ بەبێ توانای بەرامبەر بەم هەموو ئاگاداری‌یە زۆرەی کە لە پێویستی‌یەکانەوە دەرئەچن . کە پێویستی‌یان بە تێر بوون بە ئەنجام گەیاندن هەیە .**

پێویستە لێرەدا ئەمەش ڕوون بکەینەوە کە جیابوونەوەی منالّ لە دایك وەکو هەست‌کردنی منالەکە بە چۆڵی‌یەك‌و خۆ بەتەنیا هاتنە بەرچاو ترسی‌و سامێك لە دەروونیا سەر هەڵدەدا دووری‌یە ئەم ترسی‌و لەرزەی ئەوکاتەی سەرەتای دروست بوونی بێ‌ئارامی منالەکە بێت .

هەروەها « ئەلفرد ئەدلر » مەسەلەی دروست بوونی بێ‌ئارامی **ئەگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی** هەست‌کردن بە ناتەواوی کە (ئەدلر) **بە پاڵ پێوەنەرێکی بنەڕەتی** ئەزانێ بۆ دووچار بوونی نەخۆشیەکانی دەمارەکی ، هەروەها لەجیی خۆیەتی کە باوەڕ بە خۆ نەکردن بکەینە هۆیەکی گرنگ بۆ دروست‌بوونی بێ‌ئارامی چونکە باوەڕ بە خۆ نەکردن لە ئەنجامی هەست کردن بە ناتەواوی یەوە دروست ئەبێت ئینجا ئەم هەست کردن بە ناتەواوی‌یەش چ دەرووی بێت یاخود جەستەیی ، چونکە کەسی هەست کردوو بە ناتەواوی ئارادەیەکی زۆر بیرکردنەوەو ئەندێشەی خۆی بەو (هەستە)وە ئەبەستێتەوەو هەردەم لە دەروونیدا خولّ ئەخواتەوە بۆیە چونیەتی بیرکردنەوە رۆلێکی گرنگ **ئەبینی لە دروست بوونی بێ‌ئارامی‌دا** بۆ دۆزینەوەی ڕێگای راستی بیرکردنەوە پێویستە خۆمان لەم بیرو باوەڕە باوە بپارێزین ئەڵێ : «بێ ئارامی حەسرەتی بێ هێزەکان‌و سەر نەکەوتووەکانە ... » بەڵکو پێویستە بە پێچەوانەوە وەری‌بگرین، کە « بێ‌ئارامی » : بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی بە هێزایەتی .

**« هوستین موقەننس » ئەڵێ :**

ئێمە بەختەوەرین چونکە بی‌ئارامین ...

ئێمە بەختەوەرین چونکە ئەم بێ‌ئارامی‌یە پاڵمان پێوە ئەنێت بۆ بیرکردنەوەو خەون بینین‌و هیوا خواستن .

مرۆڤ بە درێژایی ژیان هیوای هەیە ... تەمەن کۆتایی نایەت هەتا هیوا کۆتایی نەیەت »

نووسەری فەرەنسی بە ناوبانگ ـ جان جاك رۆسۆ ـ بێ‌ئارامی بە کلیلی دەرگای ژیانی ئەزانێت ئەو بێ‌ئارامی‌یەی کە ئەبێتە هۆی **بە ئاگا هێنانی نووستووەکان** هەروەکو لە «وورد بوونەوەی گەڕۆکێکی تەنیا»دا ئەلی : ـ « ئەو گەڕانە بەرەو کوێم ئەبات... ئایا ئامانجێکم نی‌یە کە بۆی هەوڵ بدەم ... ؟ نازانم .... بەڵام بەختەوەرم کە نایزانم .... چونکە کەزانیم کۆتایی دێت .... »

ئەگەر سەیری مێژووی ژیانی زاناو گەورە نووسەران‌و بلیمەتەکانی جیهان بکەین ئەبینین کە زۆربەی زۆریان لە دۆخێکی دلّ تەنگی‌و بێ‌ئارامی‌دا ژیاون بەڵام لە هەندێ لە قۆناغەکانی ژیانیاندا توانیویانە بەسەر ئەم بێ ئارامی‌یەدا زالّ بن هەروەکو لەسەرەوە ووتمان **کە زۆر جاران مرۆڤ خۆی بەر پرسیارە لە دروست بوونی بێ‌ئارامی ئەویش بە بیرکردنەوەیەکی خەیالی رووت‌و بەراست زانینی ئەم خەیاڵە** ، هەروەکو ئەبینین (تشارلس سبرد جون)رانومایی‌کەری ئینکلیزی بە ناوبانگ لە چەرخی نوزدەهەم‌دا بە ئاشکرا دان بەو راستی‌یەدا ئەنێ کە ئەلی : « هەرکاتێ کەداوای ووتار خوێندنەوەم لێ‌ئەکرا لە کۆبوونەوەیەکی گشتی‌دا .. یەکسەر ترسی‌و بێ‌ئارامی‌و دوو دلّی سواری ملم ئەبوون هەتا وام لێ ئەهات خۆزگەی لاق شکاندن بخوازم ئەوەکو بگەمە ئەو رۆژەی کە ووتارەکە بخوێنمەوە » لە ئەنجاما کە ئەجووە سەر دوانگە « مینبەر » دوودلّی‌و رەنگ بزرکان تەواو ئەیان شێواند دانیشتوان‌و گوێگرەکان بە شێوەیەکی ناشیاوو ناشیرین بیریان لی ئەکردەوە ..

• رۆژێکیان « سبردجون » دانیشتبوو .... **دۆخی ژیانی خۆی شێ ئەکردەوەو لێی وورد ئەبۆوە** پرسیاری لە خۆی ئەکرد ... چ شتێکی نالەبار روو ئەدات ئەگەر ئەمجارەیان بە شێوەیەکی ئاسایی ووتارەکەم بخوێنمەوە .... بە زووترین کات بڕیاری ئەوەی‌دا کە هەرچی‌یەك روو بدات ... خۆ ئاسمان‌و زەوی جووت نابێت .... دۆخەو کێشەی بیرکردنەوەی تا ئەهات سەری ئەکردو گەورە تر ئەبوو جیهانی ئەهەژاندەوە .... کاتی بێ‌ئارامی‌و

دوودلی‌یەکەی خۆی بەم چەشنە بینی کە تەنیا خەیاڵەو بیرکردنەوەیەکی بۆشەو بەس ... رژد بوو لەسەر ئەوەی کە ئەمجارەیان ئەتوانێ بە رێگایەکی باشترو پوختتر لەوانی پێشووی قسە بکاو ووتار بخوێنێتەوە . چونکە چیتر مێشکی خۆی بە ترسی‌و لەرزێك خەریك نەکرد کە بوونی راستەقینەیان نی‌یە ... بیرکردنەوەیەك کە ئەقل پی‌ی‌رازی نی‌یە . ئابەم جۆرە توانی ببێتە گەورە ترین رێ‌نیشاندەری چەرخی خۆی .

پێویستە ئلوا سەیری بێ‌ئارامی بکەین کە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی هێزی دەمارەکی « القوە العصبیە » یا بە شێوەیەکی تر ئەم هێزە سوود بەخشە شاراوەیەیە کە لە ناخی ناوەوەی مرۆڤ دایە .

بێ‌ئارامی هیچ کاتێ ئازارمان نادات تەنیا ئەو کاتانە نەبێت **کە ئەم هێزە شاراوەیە لە بواری نەزانین‌و بێ سوودی‌دا لە دەست بدەین** . چارە سەری سەرکەوتوانە لەوە دایە کە دان بنێین بە بی ئارامی کە بەشێکە لە ژیانمان‌و زانینمان **بە چۆنەتی سوود لێ وەرگرتنی** ، ئەمەش لە لە رێگای ئاراستە کردنی ئەم هێزەو بەکارهێنانی لە بواری بەرهەمداری باش‌دا دێتە کایەوە .

فەیلەسوفی ئەمەریکی « هنری دایڤید ثورو » **[ دیتی کە بە نزم کردنەوەی رادەی پێویستیەکان بۆ نزم ترین رادە** ئەتوانین تام‌و چێژ زیاتر لە ژیان وەربگرین ]

ئەوکاتە بیرکردنەوەشمان بۆ وەدەست خستنی سامان‌و دەرامەتی زیاتر بۆ تێرکردنی ئارەزووی زیاتر نابێتە هۆی دڵ تەنگی‌و بێ‌ئارامی مان . وە (ثورو) بۆی روون بۆتەوە کە زۆرشت هەیە مرۆڤ بەبێ ئەوانیش ئەتوانێت بژیت چونکە بوون‌و نەبوونیان وەك یەکە .

ئابەم جۆرە ( سوکرات ) ی فەیلەسوف‌و حەکیم دوو هەزار ساڵ بەر لە ئێستا پەیرەوی ئەم بیرۆزەی کردووە .... **خۆشترین ژیانی بەسەر بردووە :**

سوکرات راوکەرێکی بیرە لەدارەتی دونیادا تەنیا کونە بەلەمێکی هەبووە خانوویەکی بچوك لە رۆخ دەریاکە وەستاوی ژێر بەزەیی باو شەپۆلەکانی دەریاو رووداوە دڵ رەقەکانی سروشت ... بیری لە کۆکردنەوەی پوول وپارەو دەرامەت نەکردۆتەوە . ئەوەی لە لایا گرنگ بووە ( سەر بە خۆیی سەربەستی ) لە هەڵس‌و کەوتیاو لەسەرە خۆبە کپی‌و هێمنی ئەژیا ..

ئەم جۆرە راوەکەرە پێویستە پێوانەو سەنگی مەحەك بێت بۆ ئەو کەسانەی کە ژیان بە هونەری کۆکردنەوەی پول‌و پارەو سامانی ماددی ئەزانن ... پشووو حەسانەوەیان لە خۆیان هەڵگرتووەو هەموویان کردۆتە قوربانی ئەم رێگایە . بیر لە هیچ شتی ناکەنەوە تەنیا ئەو رۆژگارە نەبێت کە رێگای کۆکردنەوەی سامانیان لێ‌بگرێ ... **ئەوانە هەرگیز لە ژیانێکی** تەنگ‌و دوودلی یەکی بەر دەوام‌دا ئەژین رێگاو کلۆج زۆرە کە بە هۆیانەوە بتوانین دەست نیشانی سەختی گیروگرفتەکانی خۆمانیان پی‌بکەین‌و بە پێوەرێکی راست‌و رەوان هەڵیان بسەنگێنین .

« ئەندریە جید » کاتێ کە پیانۆ لێ‌ئەدا ... دوو دلی بەشتێکی ئاسایی ئەزانێ سەبارەت بەو ئاوازە بەسۆزو خرۆشەی کە لە ژێر پەنجەکانیا هەڵئەقوڵێ ... هەروەها « لیون تولستوی » کاتی کە لەئاوابوونی خۆر بە پشت دەشت‌و دارستانەکاندا وورد ئەبێتەوە ... شەرمی بە خۆیە کە بیرکردنەوەی خۆی بەم جۆرە خەیاڵانە ببەستێتەوە .. لە کاتێکا ئەم جیهانە پان‌و بەرینە بەم جۆرە جوانی‌یەی سروشت رازاوەتەوە .

« ئەلسەر ونستون » خەم پەژارەی ئەم جیهانەی کەوتبووە سەر شانی لە کاتی شەری جیهانگری دووەم‌دا ... **زۆر جاران خۆی لە بۆخەی شەرو هەرای رامیاری دوور ئەخستەوە تابلۆیەکی رەنگی وێنە ئەکرد** « هنری ووردبتشر » .ئەلێ : ـ

کارکردن مرۆڤ ناکوژێ .... بەڵکو دوودلی ئەبێتە هۆی کوشتنی ، کارکردن تەندروستی‌یە .... دوودلی ژەنگێکە تیغی جەوهەردار کول ئەکا ئەیسوێ .

« سەرچاوەکان »


(١) گۆڤاری « البیان » ژمارە ٩٣ کانوونی دووەم ١٩٧٣

(٢) کتاب « القلق » سیجمند فروید

(٣) گۆڤاری « الهلال » آب ١٩٧٧

(٤) گۆڤاری « الرسالە الاسلامیە » ژمارە ١٠ ساڵی دەیەم .

(٥) نامیلکەی « نظریە فروید » دراسە و تحلیل ـ محمود علی الفلاحی .

# شیزوفرینیا چی یەو چۆن چارەسەر دەکرێت

ناصح کمال عثمان

● شیزۆفرینیا یا ئەسکیزۆفرینیا (الفصام) یەکێکە لەو نەخۆشی‌یە باوانەی زۆر کەس پێوەی ئەناڵێنن . ئەم نەخۆشی‌یە بە زۆری لە سەردەمی هەرزەکاری‌دا (المراهقه) ڕوو ئەدات واتە لە نێوان (١٥ــ٣٠) ساڵ بۆیەش بە شێتی‌ی هەرزەکاری ناو ئەبرێت .

ئەم نەخۆشی‌یە لەوەوە دەست‌پێ‌ئەکات مرۆڤ وردە وردە خەیاڵ باڵ بەسەر دەروونی‌دائە کێشی زۆر تووشی خەونی بە ئاگایی ( احلام اليقظه ) دەبێت . هەتا بێت زیاتر لە خەیاڵدا نوقم ئەبی‌و زیاتر لە جیهانی راستی دوورئەکەوێتەوە تاوای لێ دێ ئەکەوێتە خەوێکی قووڵەوەو وەک بێ گیانێکی لێدێ لە ئاستی هەموو بزوێنەرەکانی دەوروبەردا . هیچ شتێ کاری تێ ناکات‌و خەیاڵی ناپچرێنێ . بەکورتی پەیوەندی بە واقیعەوە نامێنی‌و جیهانی خودی لە هی مەوزوعی ئەپچرێنی‌و لەوەی یەکەمدا گیر دەخوات ،

شیزۆفرینیا زیاتر تووشی لاوان دەبێ بە کوڕو کچەوە لە سەردەمی هەرزەکاری‌دا ئەمیش پەیوەندی بە باری ژیانی هەرزەکارەوە هەیە .

هۆیەکانی بە تەواوی ئەم نەخۆشی‌یە دیاری نەکراوە. هەندێك دەڵێن پەیوەندی بە زکماکەوە هەیە ، بەڵگەشیان ئەوەیە زۆرجار نەخۆش خزمی تری ، هەیە تووشی هەمان نەخۆشی یا نەخۆشی تری دەروونی بووین هەروەها ئەوەش کە بە زۆری ئەم نەخۆشی‌یە لەوانەدا دەرئەکەوێ کە کەڵەگەت‌و لاوازو دەم‌و چاو درێژکۆلەن وە کەچەڵ نابن .

هەندێکی تر دەڵێن تووش‌بوون بەم نەخۆشی‌یە



ئەگەڕێتەوە بۆ تێکچوونی فرمانی کۆیرە گلاندەکان (الغدد الصماء) واتە ئەو گلاندانەی کە ڕاستەوخۆ هۆرمۆنەکانیان دەکەونە خوێنەوەو کارلە گەشەو بەڕێوە چوونی فرمانەکانی لەش ئەکەن .

هۆیەکی تریشی وەک(کریبلن) دەڵێت ژەهراوی بوونە لە ناوەوەی لەشدا بە هۆی کارلێکردنی کیمیایی‌یە .

ئەم هۆیانەی سەرەوە هەرچۆنی بنو کاریان هەرچەندبێ ناتوانن کەسێ تووشی شیزۆفرینیا بکەن کە زروفی ژیانی یارمەتی دەر نەبێ . بۆیە هۆی سەرەکی‌و گرنگ ڕوو بەڕوو بوونەوەی مرۆڤە لەگەڵ ئەو زروفانەی ژیاندا کە لە ژوور توانایەوەن‌و ناچارە بیان کات . واتە بەکورتی هۆی شیزۆفرینیا لەم رستەیەدا کورت دەکرێتەوە ( من ناتوانم بژیم )

کاتێ کەسێ ( بەتایبەتی ئەگەر لەوەوپێش لەخۆشی‌و نازدا ژیابی ) ئەکەوێتە بارێکەوە ناتوانێ بە دڵی خۆی هەڵسێ‌و دابنیشێ ، کاتێ ناچار ئەبی هەرچەند پڕ بەدڵ پێ‌ی ناخۆشەو ناتوانێ، کارێ بکات، کاتێ بێ بەش دەبێ لە خۆشی ، لە ڕابواردن ، لەهەموو هۆیەکی حەسانەوە، کاتێ ئەمانەی بەسەردێ تا ئەوپەڕی ڕادە بێزار ئەبێ‌و کارو فرمان‌و ژیان لەبەر چاوی رەش ئەبێ ، بۆیە ناچار ئەبێ بۆ ئەوەی پارسەنگی ئەم تاڵی‌یە بداتەوە پەنابباتە بەر خەیاڵ‌و دووڕ پەرێزی، جلەو بۆ خەیاڵی شل ئەکات‌و چێژ لە خەیاڵەکانی وەرئەگرێت. وای لی دێ خەیاڵ بەسەریدا زاڵ ئەبێ‌و تەنانەت لەخۆی‌دا ئەلوێتەوەو ئاگای لەدەوروبەر نامێنێ .

ڕاستە خەیاڵ‌و بگرە خەیاڵ پلاویش تووشی هەموو کەسێکی ئاسایی دێ . هەر یەک لەئێمە بگری جار جار دوورە پەرێز ئەبێ‌و وەک ئەڵێن (ئەچێتە ژێری) ئاگای لەکەس نامێنی کە بە بەردەمیا ئەروا هەرچەندە چاوی زەقەو دەروانی کەچی جگە لە تارمایی‌یەک هەست بەهیچی تر ناکات . بەڵام ئەم هەڵوێستە وەختی‌یەو زۆر ناخایەنێو لەگەڵ لێ‌پەڕینی‌دا مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی‌و پێکەنین‌و بەجێ‌هێنانی ئاسایی فرمانەکانی . بەڵام خەیاڵی شیزۆفرینایی کات‌و ڕادە نازانی ، ئەو زۆربەی کات دیلی خەیاڵەکانیەتی ، کە بەبەردەمی‌دا دەورێت ، بانگی دەگەیت تەنانەت ڕاستی ئەوەشێنی وەک مێشت لێ دەرکردبێ وایە ، هیچ خۆی تێک نادات‌و ئەوپەڕی قسەیەکی ئاسایی دەکات وەک بڵێ (وامەکە)

لەبەر ئەوەی سەردەمی هەرزەکاری زیاتر دەوری دوو دڵی‌و دژواری‌یە ، بەتایبەتی لە کۆمەڵانی ڕۆژهەڵاتدا بەکوردیشەوە ئەو رەقابە یەی خراوەتە سەر (جنس) جیاکردنەوەی کوڕو کچ‌و بە شوورەیی دانانی (جنس) ئەمانە هەموو دەردی هەرزەکار زیاددەکەن‌و ناچاری دەکەن ئارەزووەکانی بخواتەوە (یکظمها) و پەنابەرێتە بەر هۆی وا کە خۆشی بەلایەوە گوناه بێت . ئەو لاوەی کەجارێك یا زیاتر لە دلداری‌دا ژێر دەکەوێ ئەگەر خۆی بدات بەدەستەوە ئەگونجێ خۆی بەرەو ئەم نەخۆشی‌یە بەرێت . یا ئەو هەرزەکارەی بە هۆی نەبوونی هۆیەکانی ( تەفریغی ) وزەی جنسیەوە پەنا ئەباتە بەر ( عادەتی سری )و لە هەمان کاتدا وا دەزانی ئەمە کارێکی ناڕەوایەو هەست بەگوناه دەکات ، ویژدانی تێک‌دەچێ‌و ئەم نەخۆشی‌یەی لێ‌دیار ئەدات .

هەموو ئەو دارووخانانەی بەسەر مرۆڤدا دێن وەک سەرنەکەوتن لەکاردا یا لەژن هێنانىدا یا لە شووکردندا ، یا لە هاوڕێ‌یەتی‌دا .... بۆیان هەیە مرۆڤی ئامادە واتە کەسێک نەتوانێ ڕووبەڕووی ژیان بێتەوە ، لەم نەخۆشی‌یە نزیک بکەنەوە .

ئەو منالەی بە ناز بەخێو دەکرێت ئیمکانی تووش بوونی زیاترە چونکە بە دژواری‌و تەنانەت جێ‌بەجێ نەبوونی داواکانیش رانەهاتوە بۆیە هەمیشە ئەیەوێ هەموو کەس‌و هەموو شتێک لە بەردەمی‌دا سەر شۆڕ بێت ، بەڵام کاتێ ڕووبەڕووی ژیان ئەبێتەوەو ئەوەی بۆ نالوێ‌و تەنانەت هەندێ‌جار ناچاریش دەبێ لەبەردەم زروفدا سەر شۆر بکات توانای بەرگەگرتنی ئەم زروفانەی نامێنێ‌و خۆی ئەدات بە دەستەوە .

**جیا کەرەوەکانی :**

بە پێی ڕادەی توندی نەخۆشی‌یەکە جیاکەرەوەکانیشی دەگۆڕێن، بەڵام بەگشتی نەخۆشێکی نموونەیی بە مانەی خوارەوە جیائەکرێتەوە .

● نەخۆش عاتیفەیەکی ساردی دەبێت واتە ئەو شتانەی لەدەوری ڕووئەدەن کاریان تی‌ناکات‌و بایەخ بە هیچ شتێك نادات ، . تەنانەت وای لێ‌دێ ترس ، خەفەت ، تووڕەیی .. لای نامێنن . بو نموونە ئەگەر پێ‌ی بوترێ یا براکەت مردووە

یا ماڵەکەت دزراوە هیچ خۆی تێك نادات و وەڵام دانەوەکەی زۆر هێمن‌و ئاسایی دەبێ .

● نەخۆش لە خەیاڵێکی قووڵدا ئەژی،ئاگای لە واقیع نامێنێ،بۆیە لە کۆمەڵ‌و خەڵك دوورئەکەوێتەوە تا لە تەنیایی‌دا جڵەو بۆ خەیاڵی شل بکات‌و واقعێکی زاتی بۆ خۆی دروست بکات‌و داخی دڵی تیا هەڵ ڕێژێ .

● هەر ئیشارەت وشتێك ببێنی وا دەزانی باسی ئەوە بۆ نمونە ئەگەر دووکەس ئیشارەت بۆ یەکتر بکەن وا دەزانی باسی ئەم دەکەن . یا چیرۆکی دەخوێنێتەوە یا گوێی لێ‌دەبێ وا دەزانێ باسی ئەم دەکات بۆیە واز لە خوێندنەوەی دەهێنی یا لە هۆڵی شانۆگەری‌یەکە ئەچێتە دەرەوە .

● نەخۆش تووشی هەڵوەسەی بیستن‌و بینین‌و بۆن‌کردن دەبێ واتە گوێ‌و چاوو لووتی ڕێشکەو پێشکە ئەکەن ، وەك ئەوەی هەر لە خۆیەوە گوێی دەزرنگێتەوەو وا دەزانی بانگی ئەکەن یا قسەی پی‌ئەڵێن . یا چاوی ڕێشکەو پێشکە ئەکەن وا دەزانێ کەسێك لەبەر دەمیدایە . یا هەر لە خۆیەوەهەست بە بۆن ئەکات بێ ئەوەی شتێکی بۆندار لە نزیکەوە بێ .

لەم دیاردەی هەڵوەسەیەوە زۆرجار ڕەوشتی دوژمنانەی‌نەخۆش سەر هەڵ ئەدات . بو نموونەکانی تووشی هەڵوەسەی گوێ ئەبی وا ئەزانێ بەرامبەرەکەی یا دکتۆرەکەی بانگی ئەکات یا جنێوی پێ ئەدات‌بۆیە جاری وا هەیە توورە دەبێ‌و ڕەوشتی دوژمنانە دەنوێنی‌و دەست ئەوە شێنێ .

کەوابێ شزۆفرینایی دوو کەسایەتی جیاوازی هەیە جارێك هێمن‌وبێ ئاگایەو هیچ نای بزوێنێ، جارێکیش لە خۆیەوە هێرش دەباتە سەرت یا سەر دکتۆرەکەی و هەوڵی خنکاندنی ئەدات ، ئەمەش وەك وتمان لە ئەنجامی هەڵوەسەی گوێ‌یەوە . تەنانەت ئەگونجێ هەر لەخۆیەوە بێ ئەوەی کەسی لای‌بێت هێرش بەرێتە سەر دکتۆرەکەی‌و قسەی پی بڵێ‌و بی خنکێنێ بێ ئەوەی دکتۆری لابێت ، واتە تووشی هەڵوەسەی بینین بووەو وا ئەزانێ دکتۆرەکەی لەبەردەم دایە .

● هەندێ جار دا توندی بێ ئاگایی‌و نوقم بوون لە خەیاڵدا ئەگاتە ڕادەیەك نەخۆش هەست بە هیچ پێویستی‌یەکی تەنانەت لاشەیش ناکات . برسێتی ، تینوێتی ، غەریزەی خۆپاراستن ... هەست بە هیچیان ناکات بۆیە زۆرجار ناچار دەبن خواردن بە زۆری بکەنە قورگی‌یەوە .

زۆربەی نەخۆشەکان هەست بەنائومیدی ئەکەن‌وا دەزانن کۆمەڵ‌و خەڵك تلوانبارن‌و هەموو شت بەرامبەر ئەو زۆدارە، خۆشی بە زۆر لێ‌کراوێك دەزانێ هەموو جیهانی بۆ لەکەمیندایە . واتە بە زۆری تووشی (ماسوکی‌یەن) دەبێت ، هەرچەندە وەك وتمان هەندێ جار نەخۆشی هەڵ دەگەڕێتەوە بۆ (سادیزم)و وەك مرۆڤێکی (سادی) خۆی وەنوێنی .

جاری واهەیە نەخۆش ماوەیەکی زۆر لە وەزعێکدا ئەمینێتەوە . بۆ نموونە نەخۆشێك ماوەیەکی نۆر بە پێوە وەستاوە ، دەسی ڕاستی خستۆتە سەر ڕانی‌و دەسی چەپی بەرەو سەرەوە درێژکردۆتەوە کە بە نیازی خۆی (مەسینە) یا (قۆری چای) دروست کردووە. بەڵام سەیر لەوەدایە دوای ئەوەی تاقەتی چووە هەرچی ڕووی‌داوە لە دەوری گێراویەتیەوە.

## چارەسەر کردنی

پێش ئەوەی باسی چارەسەرکردن بکەین باشی‌وایە لە خۆپاراستن بدوێین کە هەمیشە لە چارەسارکردن باشترە ،

شیزۆفرینیا هەر بریتی نیە لە تێك شکانی مرۆڤ لە بەرامبەر ناهەمواری‌یەکانی ژیان‌دا چونکە ئەگەر وا بوایە ئەبوو هەموومان نەخۆش بووینایە ، بەڵکوو بریتی‌یە لە لەبیر نەبردنەوەی کەوتنەکان‌و و ڕەبەردان ، بەزەیی بەخودا هاتنەوەو کرووزانە وە . کەوتن‌و تێك‌شکان کاتێ مرۆڤ بەرەو شیزۆفرینیا ئەبەن کە مرۆڤ ئامادەبێ بەسەر ژیانی ڕابردووی‌دا شین بکات ، بەزین بە چاکترین چار بزانی ، پەنابباتە بەر بە زەیی بەخۆدا هاتنەوە .

ئەو کەسانەی ئیرادەیان بە هێزەو دژواری‌یان زۆر دیوە زەحمەتە تووشی ئەم نەخۆشی‌یە ببن چونکە ئەوانە هەمیشە وەرەیان بەرزەو بە چاوێکی گەشەوە لە داهاتوو دەڕوانن .

بەزەیی بە خۆدا هاتنەوە مرۆڤ بەرەو کەندەڵانی تێك شکان دەبات چونکە لەم بارەدا مرۆڤ کە دەوری ماسۆکی‌یەك دەبینێ وەسیلەیەك شك نابات دەردو ئازاری پێ کەم بکاتەوە ئەوە نەبێ داخی دڵی خۆی بۆ خۆی هەڵ ڕیژێ . دیارە ئەم داخ هەڵ رشتنەش دوورە پەرێزی‌و تەنیایی

دەوێت ، ئەوساش مرۆڤ کە تەنیا بوو چی لە سکدایە بۆ خۆی هەڵ دەرێژێ‌و هەموو مرۆڤ بە دوژمن دەزانێ تەنیا خۆی هەقە کەچی هەر خۆشی بەشی هەر شەقە . ئەم مرۆڤە بەو پی‌یەی ماسوکی یە چێژ لەم رازو گلەیی‌و بەزەیی بە خۆدا بە هاتنەوەیەی وەرگرێ بۆیە حەز ئەکا زوو زوو دووبارەی بکاتەوە و بچێتە خەڵوە تا سەرەنجام ئەیکاتە خەڵوەتی هەمیشەیی .

بۆ ئەوەی تووشی ئەم دەردە نەبێت ئەوەندە بەزەییت بە خۆتدا نەیەتەوە ، لە جیاتی ئەوەی سکالا بۆ خۆت دەربڕێت بۆ کەسێکی تری دەربڕە چونکە لەلایەکەوە لێشاوی دڵت بەش دەکەیت لە لایەکی تریشەوە ئەو کەسە بە شێوەیەکی مەوزوعی‌تر لەخۆت وەمەسەلەکەت بۆ لێك ئەداتەوە کە ڕەنگە بەزەیی بەخۆدا هاتنەوەکەت کەم بکاتەوە .

بۆ ئەوەی خۆت نەدەیت بەدەست ئەم نەخۆشی‌یەوە هەمیشە گەشبین بە خۆت فێری ئیحا بەخۆدان ( الایحاء الذاتی ) بکە واتە هەمیشە بە خۆت بڵی ( هیچ شتێك نام بەزێنی ، ئەبێ هەموو شتێك بەزێنم ) ، بەڵی راستە پیاو ئارەزوو بێنێ کێو لەبن دێنێ .

دایکان‌و باوکان ، منالەکانتان بە ناز بەخێومەکەن ، بە زۆریش هەموو شتێکیان بە سەردا مەسەپێنن چونکە لە هەردوو بارەکەدا ئامادەیی‌یەك تیایاندا دروست دەبێت بۆ ئەم نەخەۆشی‌یەو ئەوانی‌تر . ئەو منالەی نازی دەدرێتێ کاتی گەورە ئەبێ ، پشت بە خۆ بەستن نازانێ‌و زەحمەتی نەدیوە بۆیەکە بەرەو رووی واقیع دەبێتەوە نازانێ چۆن بەرگەی ناهەمواری بگرێت . ئەو منالەش کە زۆر بەخێو دەکرێ هەر لەسەرەتاوە لەژیان بێزار ئەبی‌و ئەگونجێ ورەی بڕوخێ .

چارەسەرکردنی شیزۆفرینیا وەك هۆیەکانی جیاوازە . لە چارەسەری لاشەیی‌دا هەندێ جار کارەبا بەکاردەهێزێت . یا ئەگەر رادەی شەکر لە خوێنی نەخۆشەکەدا زۆر بێت (ئەنسۆلین)ی ئەدرێتی . هەندێ جاریش (جەراحەی) مێشك بەکار دەهێزێت .

چارەسەری گرنگ بریتی‌یە لە چارەسەرکردنی دەروونی کە ئەمیش بریتی‌نیە لە چارەسەرکردنی مێشکی نەخۆش کە چونکە نەخۆشی‌یەکە هەرچەندە لەوێدایە بەڵام هۆیەکەی بە زۆری لەدەرەوەیە ، کەواتە پێویستە لە دەرەوە دست‌پێ‌بکەین . چاك وایە مێژووی ژیانی نەخۆشەکە پێش توش بوونی‌و پاش تووش بوونی لێ‌بکۆڵرێتەوە تا بۆمان دەربکەوێ هۆی نەخۆشی‌یەکە چی‌یە . ئایا تووش بوونیەتی بە کارێك لەتوانایدا نیە ، یا تێکشاندنی دلداری‌یە ، یا هاورێ‌یەتی یا خێزان .... ئەگەر توانیمان هۆیەکەی دەرەوە دیاربکەین ئەوا دەشتوانین چارەسەر ی بکەین .

بۆ نموونە پێویستە ئەو زەختەی لەسەر نەخۆشە لابرێت ، واتە ژیان کە لە بەرچاوی رەش بووە وا لێ‌بکەین پێشوازی بکات واتە ئاسانی بکەین .

پێویستە نەخۆش دڵنیا بکرێت، ڕێ‌ی حەسانەوەو سەیران‌و تێکەڵاوی‌و سینەماو شتی‌تری بدرێت . ئەگەر ژن‌بوو سەربەستی بدرێتێ ئەگەر منداڵ بوو ڕێ‌ی یاری‌و دلخوشی لێ نەبەسترێت ،

لەگەڵ ئەم چارەسەری دەوروبەردا چاك وایەو بە کەڵکە بکرە پێویستیشە لە ڕێگەی ئیحا یا لێکوڵینەوەوە پڕوای نەخۆش بە بە خۆی زیاد بکرێت ، دڵنیا بکرێت کە دنیا ئەوەندە بێ ماناو دەروبەر ئەوەندە دڕندە نیە ئەم لەبەر دەمی دا ببەزێت بەڵکو ئەمیش وەك کەسانی تر ئەتوانێ روو بەرووی ژیان ببێتەوە ، چاك وایە هاوبەشی خەمی تێکەڵی کۆمەڵ بکرێت تا ئەوەندە بەزەیی بە خویدا نەیەتەوە .

بە جێ‌بەجێ کردنی ئەمانە نەخۆش وردە وردە بەرەو چاکی دەڕوات ، لە خەیاڵ دەکشێتەوە هەست بە دەوروبەری دەکات. کاتێ لەیەکەم هەنگاودا سەر ئەکەوێ کەمی ورەی دێتە بەر ، دوای ئەوە کە لە چەند هەنگاوێکی تردا سەر ئەکەوێ بۆی دەر ئەکەوێ روو بەروو بوونەوەی ژیان لە توانادایەو خۆ بە دەستەوە دان‌و راکردن لە واقیع پێویست نیە . بەم جۆرە چاك دەبێتەوە ، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر بارو زروفی نەخۆش هەر بە خراپی رۆیشت ئەوا چرای ئەقلی ئەکوژێتەوەو ئەبێتە شێتێکی تەواو.

**سەرچاوەکان :**

(١) عقلی‌و عقلك ـ سلامه موسی
(٢) علم النفس الاکلینیکی ـ د. مصطفی فهمی
(٣) مجله طبیبك ـ تشرین الاول ١٩٧٢

# ئەدەبێ بچیکا

گوتار

● لێك نیشانێت سەرکتنا مللەتا ئو پێش کەتناوانا گوهدان ئوماتی ژێ کرنا بچیکانە ، چونکە بچیك جانگەکێ سپیە ، ئو مروڤ دشێت ئومێدو ئەیفەزێت مللەتێ لسەر وی جانگێ سپی بنەخشینت ئو کەسینیا بچیکی ناڤابکت .

راستە ئەم دکارن بێژن بچیکی وەبکە ئو وەنەکە .. هو هەرە بەلێ هو نەچە هتد ... بەلی ژنالی سەیکولوجی ڤە وایە باوەر کو فەرماندان لبچیکا ناگەهتە ج ئارمانجا .. نەکو بتنێ ناگەهتە ج ئارمانجا ، بەلێ بەلکو وەل بچیکی بکت للژ دل خازێت کومەلێ خو راوستت ئو دێ لژیاناخودا بێ پاش کەتی بت

زبەر ڤێ چەندێ هەکەرا مەڤیا بچیکی بەروەر بکین ئو لدیف رێکا مەژێرا گێشای بچیت ، دڤێت ئەم هزرێت خو تێدا بکین ئو وەبکین کو بچیك نفرەتێ ژ وێ رێکێ نەکت ، ئەڤە ژێ دێ برێکا (حەزێ)بت . حەز تشتەکا گەلەك ببهایە لناڤ سایکولوجستا ، چونکە ئەو وەسا دبنین کو حەز پال بێ دانەکا بهێزە بو هیبونێ ئو ڤەگرتنا بیروباوەرا ، رەوشتا ، رەمەوانیێ هتد .

بچیك نەشێت تێ بگەهیت یان تشتی فێربت هەکەر وی بخو دل تێ نەبت ئو بخو حەز نەکــت ، چونکە فێربون نەتشتەکا ساناهیە ، فێربون رستەکا ئالـــوزە لناڤ بەینا مەژی والەش یە ، لەو بێ تڤی یە خاندن ئو فێربین بێتەخوش کرنێ ئانکو لبچیکی شرین بت دا حەزێ بکت ئو پشتێ هینگێ ڤەگرت .. فێربون بگەلەك رێکا دهێتە خوش کرن .. برێکا یاریا ، برێکا کارکرنێ ، برێکا چیروکا شعرا مەتەلوکا .. ئو ئەڤا دیماهی یێ دبێژی ئەدەبی ( توری ) بچیکا .

لڤێرێ مەستامە ژ فێربونێ برێکا ئەدەبـــێ تەڤەیە کو وێ چەوا وەکین کو بچیك بشێت وەجەکێ ز چیروکو شعرا بکرت ئو تشتەکێ سەح بکت ئـــو فێربت . ئەڤە قەت نابت هەکەر ئەو شعر یان ئـــەو چیروك هەڤ ژیانو هزرێت بچیکی نەبن

توری بچیکا ( ادب الاطفال ) بێ تڤی یە بدەستەکێ شەهرەزا بێتە نڤێساندنێ .. مروڤێ توری بچیکـــا بنڤیست دڤێت زانینەکا باش ب سایکولوجیا بچیکی دا هەبت ئو شەهرەزایەك بئەزمانی نەخاسمە ئەزمانێ بچیکادا هەبت ، دا بچیك بشێت بخونیت ئو تێبگەهیت چونکە پەیڤێت (کلمات)ێت گران ئو کێم بکار دێ خاندنێ لبچیکی بزەحمەت ئیخیت ئو دی گەلەك لێ ئالوزکت .

دکتور بەدرخان سندی

## چی ئو چەوا دێ بو بچیکی نفیسین : ـ

برەنکەکێ گشتی ئەدەبێ بچیکا وەك ئەدەبێ مەزنا بدوو رێکا دهێتە نفێساندن :

**١ ـ شعر**

**٢ ـ بەخشان ( چیروك وشانوگری )**

شعرێت بچیکا : ـ

لڤێرێ ئەم بەحسێ شعرێت بچیکی بخوناکین ئەوێت کوبچیك جانجارا دڤێت بخو نڤیست . ئەم بەحس وان شعرا دکین ئەوێت شاعرێت مەزن بو بچیکا دنڤێسن .

پێ تڤی‌یە شاعرێ بچیکا بزانت کو بو کیش عەمری دنڤێست ، بو بچیکێ چار سالی‌یە یان شەش سالی‌یە یان هەشت سالی هتد . چونکە قوناغێت بچیکاتی‌یێ وەکی ئێك دنینن. شاعر پێ‌تڤی‌یە دیاربکت کاوی ئەڤ شعرە بو کیش عەمری دانایە ، نەخاسمە هەکەر ئەو شعر بو خاندێ لەکتەبا هاتبت دورستکرنێ ، چونکی بچیکێ نەهـ سالی هەکەر مەشعرەت ژپایا چار سالی‌یێ مەدایێ دبت دێ ژبەرکت بەلێ نە ژڤیاناخو ئە دبت دلێ وی ژێ رەش ببت . هەر وەسا هەکەر شعر بو بچیکێ نەهـ سالی بت ئو ئەم بدین بچیکێ چار سالی دبت هەر چ ژێ تێ نەگەهیت، ئو دبیت دلێ وی هەما ژخاندنا ئەدەبێ رەش‌ببت ئو بێیك جاری .

شعرێت بچیکا پرەنکەکێ گشتی دڤێت : ـ

**١ ـ ژ وەزنێت کورت بن ئو موسیقایەك خویا تێدابت**

**٢ ـ پەیڤ ( کلمە ـ مرادف ) دڤێت ساناهی‌بن**

**٣ ـ ئارمانج ژ شعری پێ تڤی‌یە هەبت ئو یێ خویابت**

### ژبەرکرنا شعر : ـ

ژبەرکەنا شعرا نەخاسمەیدبچیکی تشتەك گەلەك باشە بشەرت بچیك بشێت ، ئو ئەو شعر گەلەکا درێژو زەحمەت نەبت . چونکی بچیك برێکاژ بەرکرنا شعرا دێ سامانەکێ ئەزمانی ژگوتن وبێژەیا پەیداکت ئو پشتی هینگێ دشێت وی سامانێ ئەزمانی ( الثروه اللغويه ) دئاخڤتنێت خودا یان دنڤێسینێت خودا بکار بینت بەلێ پا هەکەر مەدیت بچیکەك نەشێت شعرەکێ ژبەربکت پێ تڤی نینە ئەم زورداری‌یێ لێ‌بکین .. چونکی هەمی بچیك وەکی ئێك دنینن . هندك دزیرەکن هندەك نە ، هندەك حەژ ژبەرکرنا شعرا دکن هندەك نە .

## چـــیروك

بچیـــك چێتر حەژ چیروکێت گە لـــەك بدەو خەیالێڤە بچن ، ئو ئەڤە تشتەکا سایکولوجی‌یە ، ئەم نەشێن بێژین بلابچیك چیروکێت خەیالی نەخوینی بلایت راستی ( واقعی ) بخوینی چونکی مە مروڤـــێ واقعی پێ تڤی‌یە لناڤ کومەلی‌دا !! تەڤە تشتەکـــا نەراستە ئو نەزانستی‌یە .. قوناغا بچیکاتی‌یێ قوناغەکا تایبەتی‌یە دژیانا مروڤی‌دا ئو ئەڤ قوناغـــــە گەلـەك خاستن ئو پێ‌تڤی‌یت هەین ، ئو دمولەمەندکرنـــــا « خەیالێ » ئێك ژ پێ تڤی‌یت ژیانا بچیکی‌یە .

چیروك پێ تڤی‌یە کورت‌بت چونکە بچیك نەشێن پێڤەبچن هەتا دیماهی‌یێ . نەشێن خو گەلەکێ بگرن دا دیماهیا ( نەتیجا ) چیروکـــێ بزانن ، ئو هەکـــەر چیروکڤانێ ڤیا چیروکەك درێژ بنڤێست ، ئەو چیروك پێ تڤی‌یە هندە ئەنجام ( نتیجە ) یت کورت کورت تێدا هەبن دا بچیك بشێت ژ خەلکەکێ بو خەلکەکـــدی بچیت ئو هەمی چیروکێ بخوینت

هندی وێنە ( رەسم ، شکل ) لناڤ چیرۆکێ‌دا هەبن ببجیکی خوشترە ئو ئەو رەسم پتر بچیکی ڤەدکێشتە خاندنێ نەخاسمە هەکەر ئەو وێنە درەنگین‌بن ئانکو ل گەلەك رەنگا هاتبن نەخشاندن .

چیروك نڤێسێ بچیکا پێ‌تڤی‌یـــە پێش دەست بنڤێسینا چیروکاخو بکت ئارمانجا وێ چیروکێ بزانت ، ئو بزانت ئەو ئارمانج هەتا چ توخیب ببها ئو هێژایە ،

هندی رەنگی چیروکێ ئبالێ شانوگری‌یێ ڤـــە ( مەسرحی‌ڤە ) بچیت ، وێ ببچیکی خوشتربت .

نڤێسڤانێ بچیکا چ شاعربت چ چیروك نڤێسربت پێ‌تڤی‌یە پشتی بەلاڤ کرنا بەرهەمێ‌خو چ دروژنامادا یان چ بگوتن ، پێ تڤی‌یە گوهێ خو بـــدت ڤەژەنـــا ( رد الفعل ) یا بەرهەمی لنك بچیکی چیە ، ئو پـــێ تڤی‌یە زێرەڤانیەکا مکم بکت دا بزانت هەتا چ پایە شیا خزمەتا ئارمانجا وێ شعرێ یان چیروکێ بکت .. ئەڤ رەنگە سەنگاندناهە دێ هاری نڤێسڤانێ بچیکا کت بو وەج ژێ گرتنا هینگا کو تشتەك دی یا نوی بنڤێست ، لەو نڤێسڤانێ بچیکا دڤێت خو بخو سەنگاندنا بەرهەمێ خو بکت ، چونکە یاژ ملڤە ، خویندەوارێت مەزن هند بیتە نادن بەرهەمێ بو بچیکا هاتی بەلاڤ‌کرن لروژنامادا ئو کوڤارا یان کتێبا ، لەو کێم‌جارا دهێتە سەنگاندن ●

# ئەو مرۆڤەی ژیانی سەربەستی لە هەموو شتێ لا بەرزتر بووە

ئامادەکردنی : عزیز رشید حریری

● پێش چەند رۆژێك «٩٣» سالی تەواو ڕەتبوو بەسەر لەدایك بوونی « سلامە موسی » ی نووسەری ناودار و دوژمنی چەوسانەوە و زوڵمی کۆمەلایەتی ، ئەو نووسەرەی بەدرێژایی تەمەنی و بەبێ ماندووبوون و کۆڵنەدان قەڵەمەکەی لەکاردا بووە و گەنجینەیەکی تابلۆی بەنرخی لەنووسین و ڕۆشنبیری بەدیاری بۆ بەجێ هیشتووین ، کە تا ئیمرۆیش تام و چێژی تایبەتی خۆیان هەر پێوەیە ..

« سلامە موسی » ی نووسەر لە ڕۆژی سێشەممەی چواری مانگی کانوونی دووەمی سالی ١٨٨٧ ی زایینی ، لەیەکێ لە لادێکانی شاری «زقازیق» ی پارێزگەی « الشرقیە » لەدایك بووە .

زیاتر لەپەنجا سالی تەمەنی بەکتێبدانان و نووسینەوەبەسەر بردووەو بیریزانیاری و مرۆڤایەتی بەناو خەلکیدا بلاوکردۆتەوە ، هەلگری مەشخەلی ئازادی و سۆشیالیستی و پێشکەوتن بووە ، لەپێناو بەدی هێنانی ئەم مەبەستانەیشی پێنووسەکەی ناوداوە بۆ بەربەرەکانی کردنی زوڵم و دەست بەسەراگرتن و چەوساندنەوە ، لەڕێگەی پارێزگاری کردن لەمافی گەل و ژیانی سەربەرزی و پڕ کەرامەت .

● **نووسین و بەرهەمەکانی نووسەر**

. نووسەر نزیکەی پەنجا کتێبی دەرکردووە و بەشی زوری ئەو کتێبانە دەورێکی بالایان لە ڕۆشنبیرکردنی نەوەی تازەدا بینیووە ، لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆماندا بەدەگمەن ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتنخوازمان بەرچاو دەکەوێ کەنووسینەکانی ئەم نووسەرە کاری تێنەکردبێ ، وەلەو کتێبە بەناوبانگانەی کەنووسەر دەری کردوون و بەزۆربەی زۆری وولاتانی جیهاندا بلاو بوونەتەوە ئەمانەن :

[ « ئازادی بیرو ـ پالەوانەکانی لەمێژوودا » و « هەلبژاردەکانی سلامە موسی » و « لەزیان و لەئەدەبدا » و «تیۆری گەشەکردن و نەژادی مرۆڤ» و « پەروەردەی سلامە موسی » و « ئەدەبی گەل » و « ڕێگای سەربەرزی بۆلاوان » . ]

ئەم نووسەرە ناودارە کەلەدلی دەیەها ڕۆشبیرو نووسەرانی جیهان شوێنی خۆی کردۆتەوە ، وەنەبێ وەکو قووتابیەك بوو بێت و لەدانشگادا فێری زانست و زانیاری بوو بێت ، بەلکو هەموو ئەو زانیاریانەی کەبوویەتی لەبەسەرهات و کێشەی ژیانی ڕۆژانەی هەڵ هێنجاوە و سوودی لە تەنگ و چەلەمەی ژیان وەرگرتووە و کردوویەتی بەخۆراکی مێشك و بەپێنووسە ڕەنگینەکەی بۆی ڕازاندوینەتەوە ، نووسەر هەر لەسەرەتای ژیانی لاویەتیەوە دلخۆشی و زیرەکی « فرج انطوان و یعقوب صروف » کاری تێکردووە و بیروباوەڕی « نتشە » و داواکاریەکانی بۆ « سۆپرمان » ی سەرنجی ڕاکێشاوە ، هەر بۆیەشە ڕووی کردۆتە دانانی کتێبی « سۆپرمان » کەیەکەمین کتێبیەتی ، بەلام زۆری نەخایاندووە تا وازی لەو بیرو باوەڕە هێناوە ..

● **نووسەر و ژیان لە دەرەوەی وولاتدا**

نووسەر زوربەی زۆری ژیانی لە دەرەوەی وولات بەسەر بردووە ، لە سالی ١٩٠٨ بۆیەکەم جار ڕووی کردۆتە شاری پاریس ، وە لەوێش باری پێشکەوتووی جوولانەوەی ڕۆشنبیری کارێکی یەجگار زۆری لێ کردووە ، بەتایبەتی ئەو نووسین و لێکۆلینەوانەی کە لە ڕۆژنامەکانی « فەرەنسا » دا

بلاوبوونەتەوە ، کە بەردەوام بەدوایانەوە وێل بووە ، کەلکێکی زۆری لێ وەرگرتوون .

لە دوایيدا بۆ ماوەی چوار ساڵ چۆتە ووڵاتی « ئینکلترە » و لەوێشدا پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی « فابیەکان » دا پەیدا کردووە کە ئەوسا « برناردشۆ و ویلز » سەرکردایەتیان کردووە ، هەر لەو کاتەشدا پرۆپاگندەی بۆ بیروباوەڕی « فابیەکان » کردووە و لەدواییدا بەیەکجاری بیروباوەڕی بەرەو ڕیبازێکی تر گۆڕاوە .

ــ لەساڵی ۱۹۲۱ دا لەگەڵ کۆمەڵێ لەپێشکەوتن خوازانــــدا بەیەکـــەوە پارتی سۆشیالیســـتیان دامەزراندووە .

هەر لەسەرەتای لاویەتیەوە داوای سەربەستی ئافرەتی کردووە و هەروەها یەکەم کـــەس بـــووە کەگرینگی داوەتە ئەدەبی میللی « فولکلور » لەڕێگەی بلاوکردنەوەی دیراسات و لێکۆلینـــەوە ســـەبارەت بەگۆرانی فۆلکلوری و ، زۆریشی حـــەز لەباس و لێکۆلینەوەی عـــەرەبی کردووە و بەزۆری زاراوەی زانیاری لەزمانی عەرەبیدا بەکار هێناوە ، جـــاچ لەبواری زانیاریەکانی مرۆڤایەتیـــەوە بوو بێت وەیا زانیاریە کلنی ترەوە .

ــ هەر لەزووەوە هەوڵی دامەزراندنی کۆمەلێکی عەرەبی داوە بەناوی « کۆمەڵەی ڕۆشنبیری زانستی » وەلەساڵی ۱۹۳۰دا کۆمەڵەی « المصری للمصـري » دامەزراندووە . جگە لەمانـەش نووســـەر تێکرای نووسینەکانی لەپێناوی مرۆڤایەتی دا بووە و هەمیشە بیرو هۆشی بەخۆشەویستی مرۆڤەوە خەریك بووە و هەست و نەست و پێنووسەکەی لەڕاژەی گەلـــدا بووە ، زۆر جاریش هێرشی بردۆتە سەر بیروباوەڕی « میسالی » و ئەدەبی لاســـایی ، وەبـــەلای ئەوەوە وابووە « گەر ئەدیب لەمچەرخەدا ــ واتە ئەوچەرخەی نووســـەر تیایدا ژیاوە ــ گەر ســـیاسی نەبێت و بەڕووداوە سیاسیەکانی جیهان و ووڵاتەوە خەریك نەبێت ئەوە بەئاشکرا دژایەتی لەگەڵ ئەو چەرخەدا دەکات کە تیایدا دەژیێت » .

هەروەها بەڕای ئەوەوە وابووە کەلەچەرخێکدا دەژیێت پڕیەتی لەشۆڕش و گۆڕانکاری کۆمەلایەتی و ئەدەبی و زانیاری .

نووسەر وەکو زۆر لەنووسەرانی تری جیهـــان تێکۆشاوە لەدژی ئەو باوەڕەی کەدەڵێ « ئەدەب بۆ ئەدەبە » ، بەلکو بەپێچەوانە داوای ئەوەی کردووە کەهەمیشـە دەبێ ئەدەب لەڕاژەی ژیان و جەماوەردا بێت ..

ــ پێش بەرپابوونی یەکەمین جەنگی جیهـــانی ، ووتوویەتی رژێمێکی تازە وەدەردەکـــەوێ و رووی ئەوروپا و مێژووی جیهان دەگۆڕێت ، هەروەهـــا ووتوویەتی ڕژێمەکانی پاشایەتی تێك دەشـــکێن و سەرەنگون دەبن و ڕژێمی کۆماری لەزۆربەی زۆری ووڵاتانی جیهاندا بلاو دەبنەوە ..

ــ ئەو نووسەرەبلیمەتە یەکێك بووە لەو کەسانەی کەپشتگیری سەربەســـتی بیروو باوەڕیان کردووە و دوژمنی دەستبەسەرداگرتن و زوڵمی کۆمـــەلایەتی بووە و هەمیشە خەلکی تێ گەیاندووە کەدەبێ جیهانێك هەبێت ، چەوسانەوە و دەستبەسەر داگرتنی تێـــدا نەبێت و هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ بۆ خێر و خۆشی مرۆڤایەتی بێت ..

## ● ڕۆژنامەگەرێتی و تەنگ و چەلەمەی ژیان

نووسەر لەگەل ئەوەشدا کەلە مەیدانی ئەدەبدا ئەسپی خۆی تاو داوە ، لەهەمان کاتیشدا ڕۆژنامـــە نووسێکی هەلکـــەوتوو بووە ، لەســـالی ۱۹۱٤ دا ڕۆژنامەگەرێتی کردووە بەپیشەیەکی سەرەکی خۆی ، ئیتر دەستی کردووە بەبلاوکردونەوەی ڕۆژنامـــەی « المستقبل » لەدواییدا چەند گۆڤارێکی یەك لەدوای یەکدا بلاوکردۆتەوە وەك [ « المجلـــة الجديدة » و « المصري » و النجمة الزهراء » و «المضمار الرياضى» و «الجمهور الرياضى» و «الفضيلة» . ] وەلەئەنجامی دەرکردنی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە تووشی دەیەهـــا کارەسات و ئەشکەنجە بووە و جگە لەوەی کە ئـــەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەیشی یەك لەدوای یەکدا قەدەغـــە کراوون و وەستێنراوون و ڕێکەی نەدراوە دەریان بکات و بلاویان بکاتەوە ، وە لەئەنجـــامدا کـــەبۆی دەرکەوتووە جارێکی تر ڕێگـــەی ئەوەی نابێـــت ڕۆژنامەیەك وەیا گۆڤارێك بەناوی خـــۆی دەربکات ، ئیتر ڕووی کردۆتە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ترو لەلای خاوەن ئیمتیازەکانیاندا وەکو سەرنووسەرێك وەیا بەشداریکار ، کاری کردووە ، وەئـــەو گۆڤـــارو ڕۆژنامانەی بەم شیوەیە کاری تیایاندا کردووە لەبیست و پێنج ڕۆژنامە و گۆڤار ڕەتێ کردووە وەك :

« المقتطف » و « الهلال » و « البلاغ » و « النداء » و « الشعلة » و « الاخبار » و زۆری تر ..

ـــ « سلامه موسى » ی نووسەر و ڕۆژنامەنووس بەدرێژایی تەمەنی پڕ لەبەرهەم و کارکردن وەنەبێ هەروەك مرۆڤێکی ساکار ژیانی بەسەر بردبێت ، بەلکو ڕووبەڕووی جۆرەها بەربەرەکانی بۆلەوە و کۆنەپەرست و دوژمنانی جارەهای جار تاوانیان بۆ هەلبەستووە و بەدزی و بەئاشکرا ئازاریان داوە ، تاگەیبوەتە ئەوەی نانیشیان بڕیوە جاری واش بووە ویستوویانە بەپارە و سامان هەلی بخەلەتێنن و لەڕێگەی لابدەن ، لەوەش زیاتر زۆر جار ترسێنراوە و هەولی ئەوەیان داوە قەلەمەکەی لەکار بخەن .

بەلام لەگەل هەموو ئەمانەشدا نووسەر هەمیشە ژیانی سەربەرزی و پڕلەکەرامەتی لەپێشەوەی هەموو شتێك داناوە و هەرگیز نەیویستووە بەچاو شۆڕی و زەلیلی بژیێت .، تا لەژیانیش دابووە کۆلی نەداوە و لەکار نەکەوتووە و بێپسانەوە شەو و ڕۆژی ژیانی خستۆتە سەریەك و لەبەرهەم نەکەوتووە ، تا لەرۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی چواری ئاغستوسی سالی ١٩٥٨ دلە فراوانەکەی بۆ دواجار پەکی کەوتووە و سەرچاوەی ئیلهامی پێنووسەکەیشی ووشك بووە .

ـ بەم جۆرە نووسەری بلیمەت و زانا « سلامه موسى » لەگەل ئەوەشدا کەبەرامبەر دەیەها تەنگ و چەلەمەی ژیان و بەربەرەکانی و دوژمنداریەلی کۆنەپەرستان بۆتەوە و زۆرجاریش هەولی نان بڕینی دراوە ، بەلکو نانیشی براوە ، بەلام هەرگیز ورەی بەرنەداوە ، تا ئەو ناوەنەمرەی لەنێو دلی کۆمەلێکی یەجگار زۆر لە خوێندەوار و ڕۆشنبیراندا شەتل کردووە ، بۆ ئەوەی هەمیشە هەر بەنەمری و سەربەرزی بمێنێتەوە ، هەزار سلاو لەگیانی ئەو نووسەرە بلیمەتە کەئیمرو «٩٣» سالی تەواو بەسەر لەدایك بوونیدا ڕەت دەبێت و مەشخەلێکە لەدونیای ڕۆشنبیریدا هەرگیز گەشە و کزبوونی بۆ نیە ...

### سەرچاوەکان

ـــ چەند دانە یەك لەبەر هەمەکانی نووسەر کە باسم کردوون .

ـــ چەند نووسینێك لە ڕۆژنامەکانی ناوخۆ .

# مەی و مەیخانە لە شیعری حەمزەدا

محمد امين احمد

دکتۆر قاسملۆ لەپێشەکی تاریکو ڕووندا دەڵێ :

( « لە ناسۆری تەشەنا » دا کە شاعیر تووشی بووەو نایەوێ قبولی بکات بە تەواوی دیارە ) (١) نەك تەنیا لە ناسۆری تەشەنادا ئەوەیان بەدیدەکرێ بەلکوو لە هەموو شیعرەکانی ( هێمن )دا چەند دەم بە خەندە بن لە پڕێکا ئەو تووڕەییەی سەر هەڵدەداتەوە ، چونکە ئەم تووڕە بوونەش ڕقی پیرۆز دەنوێنێ . بەڵام دکتۆر قاسملۆ لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێ : ( هێزی ئەوەی نیە ژیان بگۆڕێ ، ڕێگای نیە خۆی دووربخاتەوە ، دەیەوێ ڕابکاتو بە یارمەتی مەی ڕوو لە دنیایەکی خەیالی دەکات

لێرەدا دوو ڕای سەیر سەیرمان بۆ دەردەکەوێ ! ڕای یەکەمیان ئەوەیە کە گوایە هێمن بەرەو خەیاڵ ڕادەکات چونکە هێزی گۆڕینی ژیانی نەماوە !

ڕا یدووەمیان : ئەوەیە کە هێمن بە یارمەتی مەی ڕوو لە دنیایەکی خەیاڵ دەکات ( مەبەست لێرەدا «مەی» ) یە کەیە !

کەچی هێمن ئەو مەسەلەیە دەداتە پاڵ خۆی ، کە لەبەر ئەوەیە پیاو قاتە ، شەڕە بایە ، بۆیە ناتوانێ بەرەنگاری ئەوە ببێتەوە لەبەر ئەوەشە کە پەنای بردۆتە بەر مەی !

بەلای منەوە ( هێمن ) کاتێ تووشی ئەو دەردە سەریو نوشستیانە هاتووە تەنیا هۆیە سیاسییەکە نیە ، هەروەکوو خۆی ( لە کوێوە بۆ کوێ ) ی پێشەکیی دیوانەکەیدا نووسیووەو دەریبڕیوە واتە تەنیا هۆی یەکەم مەرج نیە بۆ تۆمەتکردنی هێمن کە لەژیان ڕادەکاتو توانای گۆڕینەوەی ژیان نەماوە ! بەلکوو پێویستەوایە بگەڕێینەوە سەردەمی منداڵیو لاویەتی ( هێمن ) بارە سایکۆلۆژی یەکەی بە باشی هەڵبسەنگێنینو بایەخ بە ( السیرە الذاتیە ) ی هێمن بدەین ، هەرچەندە ئەمەشیان ئەرکێکی ئاسان نیە بەڵام دەتوانین لە تۆژینەوەی شیعرەکانیو ئەزموونی شیعریو پێشەکیی دیوانەکەی تا بگەینە ئەنجامێك ، بەلگەشمان بۆ ئەمە ، ئەو خەمو خەفەتەو ئومێد نائومێدی شاعیر ، لە قوناخی لاوێتیدا هەر هەبووە . بەڵام نەك بەم شێوەیە کە یەکسەر ڕووی لە خەیال کردبێو لە واقیع ڕایکردبێ ! چونکە ئەگەر خەیاڵ نەبێ ، شیعر ئەو تامو چێژەی نابێ. بەلای منەوە ئەمەیان بەراکردنی بێناوترێ ! چونکە زورووفی ئەو سەردەمە وای لە شاعیر کردووە کە بەرەو نائومێدی بکشێ . واتە لە نیوان تووڕە بوونو هێمندا خۆی نەدۆزیوەتەوە .و ناچارە پەنا بەرێتە بەر خەیاڵو سۆزو سکاڵاو جۆرە ڕۆمانسیەتێك . وەئەم سەرباتە ڕۆمانسیەتەی هێمن زیاتر شیعرەکانی دەڕازێنێتەوە بەلکوو کاریگەرتر دەبێ ، لەگەل گیانی کوردەواریدا دەگونجێ . ئەدی چۆن ئاهو نالەی بوونو بوونەوەرەکانیش ناسووتێنێ ؟! چونکە لە ئەنجامی پێنەگەیشتنی بەیار بە مەحروومییەتی ژیانی دەزانی ! بۆیە دەبینن ناسۆری تەشەناداری هێمن لە شیعرەکانیدا لەگەل داهێنانی تازە تازەدا بەدەر دەکەون.

چونکە ( کاتێ ( سلووکی ) تایبەتی لەگەل داهێنانی هونەریی زاتیدا تێکەلاو دەبێ لە بیرو ڕاو بۆچوونی هەندێ خەلك ، ئەنجامی

ئەم دیاردەو بۆچوونانە ئالۆزبوون بۆیەکا چوون لە چۆتیەتی بیرکردنەوەی شاعیردا ، هەروەها دڵی شاعیر لە نائومێدیو تێکشکانو رەشبینیەکی فرەدا قوڵبی دەدا ئەم دیاردە نالەبارانە بوونە هۆی هاندانی شاعیر بۆ گەڕان بەدوای چارەسەری ئازارو ئەشکەنجە نەبڕاوەکانی‌دا بۆیە بە پەرۆشەوە پەنا دەباتە بەر جامی مەیی . کەواتە با ڕۆشنایەکانی خۆر لە یەکەم بێکەوە لەگەڵ کەفی بادەکانا تێکەڵ‌بێ دەبا شاء ببێتە سوار چاکی تاریکستانی ناو مەیخانەکان ئەگەر ئەم ڕایە لە سەر شاعیری مەیخۆری عەباسی (ئەبولنواس) بگونجێ ، ئەوا (هێمن)یش وەکوو شاعیرێکی مەیخۆرو سۆفی کونجی مەیخانەش دگرێتەوە . چونکە هێمن وەکوو دکتۆر قاسملۆ دەڵێ ، دەیەوێ لە واقیع ڕابکا . جا لێرەدا دەڵێین ئایا راستە ( شاعیرو هونەرمەند ڕادەکەن . یان دەیانەوێ لە واقیع ڕابکەن ؟ دەگونجێ بەکارهێنانی خەیاڵ لە داهێنانی هونەرییەکەی‌دا ببێتە هۆیەك بۆ ئەم مەستە ؟ وەپێش

هەموو شتێك پێویستە بپرسین : ئایا هونەرمەند ـ لەراستی‌دا ـ لە جیهانی واقیعو جیهانی خەیاڵ دا جیادەکرێتەوە ؟ کاتێ خەیاڵ دەبێتە توخمێکی سەرەکی ( عنصراساسی ) لە کارە هونەرییەکەی‌دا ، ئەبێ ئەو واتایە بگرێتەوە کە شاعیر یان هونەرمەند ئایا نازانی کە تەعامول لەگەڵ جیهانی خەیاڵ‌دا دەکات کە هیچ پێوەندییەك لە نێوانی شاعیرو واقیع‌دا نامێنێ ؟! ) (۱) بەم جۆرە دەبینین جیلوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ، ( راستیو خەیاڵ‌دا ناکرێ ، چونکە ( لە نێوان راستیو خەیاڵ‌دا زۆرانبازی نیە ، هەردووکیان (عنصر)ێکی کاری‌گەرن لە مەجالێکی گەورەتردا کە ئەوەشیان جیهانی هەموو شتەکانو کەسەکانو ڕووداوەکانە ، ئەو جیهانە درامی‌یە دەروونی‌یەیە ) (۲) .

کاتێ هێمن پەنا دەیانە بەر خەیاڵ و دەیەوێ لە واقیع رابکا بەو کارە ئەوەی مەبەستە کە دەبێ لە گەڵ چارە ڕەشی‌دا هەڵکا :

جا چۆن ئەو هەڵسو کەوتە ، یان ئەو ڕووداوانە کاری‌تێ‌ناکەنو نابنە هۆیەکی سەرەکی بۆ گریان فرمێسكو ئاهو ناڵەو فیغان ! دەبێ ئەو دەروونە گڕ گرتووەشی بەچی کلپەو بلێسەی دابمرکێتەوە ؟ تەنیا بە (مەیی) کە مامۆستای پایەدار دەڵێ :

**دەزانی بۆچی من هێندە پەرێشان و**
**خەفەت بارم (۱)**
**لە بازاری ژیان غەیری هونەر نیمە**
**چ سەر مایە**

چ بکات ؟ بۆ کوێ هەنگاو بنێ؟ ئەمەیە ڕاستی کە بە ئێمەی رادەگەێنی ! ئەم شیعرە وەکوو دیارە مێژووی دانانی دەگەرێتەوە سالی ۱۹۵۷/۳۲۸

ئەم مێژووەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە (هێمن) چەند بێزاری خۆی دەربڕیوە ، چۆن مەسەلەکە دەخاتە پاڵ چارەنووسی . لەوانەشە بووترێ ( هێمن ) چاری ناچارە ، کە میسالی‌یانە بیردەکاتەوە؟ بەڵام هێمن تەنیا ئەوەی نەوتووە ، بەڵکوو ، زۆربەی زۆری شاعیرانمان تووشی ئەو دەردە هاتوون . بۆ نموونەش شیعرەکانی ( مەحوی ، حاجی قادری کۆیی ، شیخ سەلام ، احمد مختار جاف ، بێ‌کەس ، پێخود قانع هتد )کە چۆن هەموویان باسی ناهەمواریی خۆیانو چارە ڕەشی هونەری کوردی دەکەن . بەڵام ئەوەی زیاتر لە یەك نزیك ببنەوە ( هێمن ) و ( سەلام ) ەو لە زۆر بەباتو وێنەی شیعری‌دا یەك دەگرنەوە .

هەر وەکوو ووتمان پەنابردنی ( هێمن ) بۆ مەیی ، لە گەڵ شاعیرانی کوردماندا وەکوو ( سەلام ) و (بێ‌کەس) هەریەکە هۆیەکی سەرەکی خۆیان هەیە هەرچەندە لە مەییو مەیخانەدا یەك دەگرنەوە بەڵام لە باس‌کردنی ( مەیی ) و جۆر بە جۆرەکانی جیادەبنەوە . بەڵام لە لای هێمنی شاعیر بە زەفی سەرهەڵدەداتو لەگەڵ(عمرالخيام)و (ئەبولنواسی) عەباسیو (شێخ سەلام) و (بێ‌کەس)دا زیاتر دەگونجێن . هەر چۆنی بووبێ (هێمن) بەشبڕاوتر بووە لەوان ، ناهومێدی لە ماڵو منداڵو خێزان ، بێوەری لە کۆمەڵی دواکەوتوو ، لە کەساسیو هەژاری ، و نەریتی کۆنو تەکیەو خانەقا ، دەیان شتی‌وا کاری‌کردۆتە سەر بیرو هۆشی هێمنو بۆتە پەنابردنی بەر مەییو مەیخانەو پیاڵەو ساغەر .

**ئەگەر مەیی نەبێ چۆن ئەو زامو**
**برینانەی شاعیر مەرهەم دەکرێ ؟!**

بەڵام چ جۆرە مەی‌یەك ؟ مەیەکی کۆنو خەست، کە لە مەستی خۆی‌دا مەست دەبی ! چونکە ئەونائومێدی‌یە ئەگەر بە مەیی چارەسەر نەکرێ ئەی بەچی دەکرێ ؟ وەکوو هیمن لە شیعری عیشقو ئازادی‌دا دەڵێ :

**لە بادە ئەم ژەمە تێرکە منی تینووی**
**جگەر سووتاو**

**بەچی دیارە کە دەبینم شەویکی‌تر ژەمێکی‌تر!**

ئەم جۆرە شیعرانەی (هێمن)ی پایەدار بە ترۆپکی شەیدابوون دادەنرێن کە لە ( کلێنەی شاعیر )دا دەڵێ :

**ئەگەر خەرمانی عومرم ئێستەکانە**
**پاکی با بی با**
**بە مەرگی تۆ مچورکێشم بە دڵدا**
**نایە با بی‌با**
**هەموو عومری ئەبەد تێ‌یدا نیە**
**خۆشی دەمێك مەستی**
**خدر ئاوی حەیاتی بۆ چبوو ؟ فێری**
**شەرابی بـا**

ئـەم شیعرەی لە سـالی ۱۹٥۹ ا وتووە ! واتە لە قوناخی دووەمو سـێیەمدا زیاتر وردەکاری ووشەو فیکری لای وی بەرەو هەوراز دەکشێ ! لێرەدا هێمن لە ( خدری زیندە ) داوا دەکات کە فێری شەراب‌بێ ، چی نەکراوە بەدوای ( ئاوی حەیات)دا دەگرڕێ ؟ واتە بە چاوێکی ( ئـەبیقۆرانە )وە دەروانێتە ژیان ، ئەم ژیانەش لای بۆتە مەیی‌و مەیخانە. ئەم ڕوانینەش هەرچەندە ڕوانینکی (عەبەسی‌یانە)یەو گیانی یاختیەتی تیادایە بەڵام دەبێ وابێ ! مەیی بیێتە هاوڕێی دێرینی ! وەکوو کە شتیوانێك ، یان تاجیرێکی کەشتی شـەکەت لە ناو گۆمی عەدمی‌یەت‌دا خۆی دەداتە دەستی مەستی‌و دەکەوێتە ناو دەریای خەیاڵی مەیی‌و مەیخانەو، ە. شەپۆلەکانی مەیی دەیهێنن‌و دەیبەن .

چونکە هەوا تووشە ، رەشەبایە ، نازانێ دەست بە کامەیانەوە بگرێت !

بۆیە سـاتەکان لای وی لەیەك بازنەیـەك‌دا دەخولێنەوە ، کـە ئەوەشیان هەر بادەو پیاڵەو ساغەرو لوبجی دەست‌و گلێنەی چاوی بـۆ دەنێرێ تا پەیتا پەیتا بۆی تێبکرێ‌و مەست‌بێ‌و بێ‌ئاگابێت ؟! تاکوو وا سڕ دەبێ ( بە مـەرگی قەسـەم مچوڕکیش بە دلیا نەیەت ! ) وەکوو شـاعیری مەیخـۆری (عباسی) ئەبولنوواس دەڵێ :

**ولو انی استزدتك فوف مابی**
**من البلوی لاعوزك المزیـد**
**ولو عرضت علی الموتی حیاتی**
**بعیش مثل عیشی لم یریـدوا**

لێرەدا ( هێمن ) نەك تەنیـا گالتە بە ( خدری زیندە ) دەکات ، بەلکو گالتەش بە جامی جەم‌دەکات، پرسیارێك : ئایا ( هێمن ) مـەیی‌و مەیخانەی کردۆتەپیشەو دروشمی ژیانی ؟! ئایا وەکـوو شـاعیرە مەیخۆرەکان بە شان‌و باڵی مەیی‌و مەیخانەو کەرەستەکانی هەڵداوە ؟ واتە : ئایا باسی بادەو ساغـەرو پیاڵەو مـەی‌گێرو قاپی مەی گۆزەو شـەرابی حـەوت رەنگی حـەوت سالەی کردووە ؟!

ئایا باسی جوانـی‌و ڕێـك‌و پێکی‌و رەنگەکانی ئەو کەرەستانەی کردووە کە مەی تێدا دەخورێنەوە ؟ وەکوو (ئەبولنوواس) دەڵی :

**صفراء لا تنزل الاحزان ساحتها**
**لو مسها حجـر مسته سراء ؟**

ئایا باسی کارتێ‌کردنی مەیی‌و تامو لەززەتی مەستی‌و سەرخۆشی کردووە ؟ بە شێوەیەکی تێکرا : ئایا « هێمن » وەکوو شاعیرە (مجینەکان) مەیی کردووە ؟ ئایا ئەو وەسپانە ـ ئەگەر هەبن یان کرابن ـ وەکوو حکایـەت دەیانگێرێتەوە ؟ واتـە : وەکوو شاعیرە مەیخـۆرەکانی سەردەمی (عەبباسی) ، کە چۆن لە نیوەشەودا ، بە مەستی گەڕاونەتەوە یان لە ئامێزی ژنێکی سۆزانـی‌دا خەویان بردبێتەوە ؟! ئایا «هێمن» وەکو شاعیرە سۆفی یەکان لـە ( معنویات ) دواوە ؟ لێرەدا نامانەوێ باسی (الخمرە الالهیە) بکەین بەڵکو لە لێکۆڵینەوەیەکی تـردا باسـی دەکەین ـ

بۆ ئەوەی لەم بابەتە ( مەیی‌و مەیخانە ) لە شـیعری هێمن‌دا ، نزیك‌بینەوە پرسیاریکی‌تر دەکەین : **ئایا هێمن تا چ ڕادەیەك لە گـەڵ (خەیامی) شاعیردا یەك دەگرێتەوە؟!** یان بۆ چ (هێمن‌و سەلام‌و بێ‌کەس) لە هەموو شـاعیران زێتر باسی مەی‌و مەیخانەیـان کردووە پەنایـان بردۆتەبەر ؟

دەیان پرسیاری وا خۆیـان دەهاوێنە ناو لێکۆڵینەوەکەمانەوە . ئایا هێمن پیاڵەیەك دەخواتـەوەو پیاڵەیەکی تریش دەکات بە سەربا بـۆ ڕاگرتنـی ( تـەوازن ) . مەستی‌یەکەی ؟ لـە ئەنجامـی باسەکەمـان‌دا وەلامـی ئـەو پرسیارانەمان دەدرێتەوەو ئەگـەر هاتوو چەنـد نموونەیـەك لـە شیعرەکانی ( سەلام ، بێ‌کەس ) مان هێنایەوە و لە گەڵ شیعرەکانـی هێمن‌دا هۆینیەوە ئـەوا بۆمـان دەردەکەوی (هێمن) تا چ ڕادەیـەك لەو بوارەی داوە !

بێ‌کەس لە (ساقی نامە)کەی‌دا دەڵێ :

**ساقی فیداتم سـاقی فیداتـم**
**دڵ پەستە هەستە ساقی فیداتم**

**حەیرانی لەنجەو بەژنو بالاتم**
**شەرابێ بابێ بۆ دلەی ماتم**
**رەونەقی شەوقی با بە حیاتم**
**لە دەستی پەستی بدا نەجاتم**
**شەرابێ وابێ عومری نووحی بێ**
**صەفا بەخشی دل نەشئەی**
**رووحی بێ**
**کۆنو (مصحفا) لە بەری جەفا**
**بەزمو رابیطەی یارانی وەفا**
**شەرابێکی وا بە تەنها جامێ**
**تەکاموول بکا خامی نەفامێ**
**قەدەح پەیا پەی پڕ کە لێواو لێو**
**بێنیەو مەترسە لە طعنەو**
**جنێو(۱)**

ئەم دەقە شیعرەی (بێکەس) بەلگەیە بۆ ئەو پرسیارانەی پێشوومان ، کە چۆن بە شێوەی (حکایەت) باسی دەکات ، مەیو قەدەح ساقیو بەزمو رەزم ، تەکاموول طعنەو جنێو کۆنو (موصەفا) ، وەکوو چیرۆکێك دەیگێڕێتەوە ، چونکە مەی لەو سەردەمەدا لە شیعرەکەی بێکەس دەردەکەوێ لە مالان دروستدەکرا بە ترسو لەرزەوە یان بە تەعنەو جنێوەوە دەستدەکەوت بۆیە بێکەس پەنجەی بو درێژکردووە ، وەکوو سەردەمی عەباسیەکاندا (ئەبولنوواس) و ( والبە بن حباب ) لە شیعرەکانیان باسیان کردووە . بەلام ئایا هێمن دەلێ چی ؟ !

**وەرە مەیگێر دەمەوێ ئەو شەو**
**خەمی دل کەم کەم(۲)**
**لووزەوم بەردە سەرێ نامەوێ**
**جورعەی کەم کەم**
**تەشەنا بۆتەوە ناسۆری دەروونم**
**دیسان**
**زامی کۆنەو بە مەیی کۆنی دەبێ**
**مەلهەم کەم .**

( هێمن )یش وەکوو ( بێکەس ) داوای شەرابێ کۆن دەکات ، چونکە زامی کۆن دەبێ بە شەرابی کۆن مەرهەم بکرێت !!

**مشتو مالی دەوێ ناوێنەیی**
**ژەنگاوی خەیال**
**مەستو گێژم کە هەتا گالە بە جامی**
**جەم کەم**

ناهومێدی وای لێدەکات ، زیاتر بەلای باخیبەتیدا بڕوات بۆیە دەلێ :

**تا نەمرو خاوە بلا پڕ بێ لە خۆشیو**
**مەستی**
**تازە بێی ناوێ ئەمن هۆدەیی خۆم**
**مەحکەم کەم .**

بەم جۆرە دەبنین بێکەس دەبەوێ خەمی دەروونی بە با دا ، کەچی هێمن (ناسۆری تەشەنا) دا پێویست ناکات وەکوو دەلێ هۆدەی خۆی مەحکەم بکات ؟ ! دووبارە بێکەس دەلێ :

**ساقی فرصەتە ساقی فرصەتە**
**دەخیل مەوەستە ساقی**
**فرصەتە(۱)**
**وەختی خواردنەوە و کەیف و**
**عوشرەتە**
**موغەننی ساتۆش رۆژی هیمەتە**
**دل زۆر گیرۆدەی دەنگو نەغمەتە**
**تۆ خوا قەتارێ دل بۆی لەت لەتە**
**بە نالەی نەیو نەغمەی ئەرغوون**
**بە نەشئەی مەیو شەرابی گول**
**گوون**
**با لە دل دەرکەین سزای**
**گەردوون**
**ناسوودە ساتێ دل ببێ مەجنون**

بەلام هێمن وەکوو بێکەس کە لەو پارچە شیعرەیەدا دەرخستووە بۆ کەیف و عوشرەت ، مەی تاخواتەوە ، هەرچەندە ( بێکەس )یش لە داخی سزای گەردوون بەولاوە نیە . کەچی هێمن دەلێ :

**لە گۆشەی بێ کەسیدا ئیستەوا**
**دلتەنگ خەمبارم(۱)**
**نیە باکم ئەگەر مالم بە جارێکی بە**
**فوردا چی ؟!**

بەلام کاتێ برینەکانی سارێژ نابێ ، هاواری لێهەلدەستێت ، دەلێ :

**لە کوێ حالی منو تۆ وا دەبوو ئەی**
**خۆپەرست ئیستا**
**ئەگەر دنیا نوسوولو قاعیدەو**
**نەزمو حیسابی با**
**بە جامی بادە تێر نابم ئەگەر مەیلت**
**هەیە ساقی**
**گلێنەی خۆم دەنێرمە خزمەتت بۆ**
**تێکە تا بێبا**

هەرچەندە جیاوازیەکی ئاشکرا لە نێوان شیعرەکەی (هێمن) و (بێکەس)دا هەیە هێمن گەلێك سوودی لە شیعری کوردی وەرگرتووە ، بە تایبەتی لە بابەت مەیو مەیخانەوە ، چونکە هێمن وەکوو بێکەس ، وەسیەتنامەی وای نەنووسیوە کە وەکوو خەیام لە پاش مردنی هەر بە مەی بیشۆن ؟ وەکوو بێکەس کردۆیەتی ! بێکەس دەلێ :

**ساقی ئۆبالی منت بە ئەستۆ**
**دنیایە وەصمەت ئەکەم لە لای تۆ(۳)**
**کە مردم توخوا هەر بە مەیی بمشۆ**
**بۆم مەکەن شینو گریانو رۆرۆ**

**لە جێی یاسین‌و تەلقین‌و شینم**
**بێن کۆڕێ بگرن لە ژوور سەرینم**
**بە بەزم‌و رەزم‌و بە ئاوازی خۆش**
**ئێسك‌و پروسكم هەموویێتە**
**جۆش**

هەروەکو ووتمان هۆی سەرەکی بۆ پەنابردنی (هێمن)و (بێ‌کەس)و (سەلام) بۆ مەیی‌و مەیخانە دەگەڕێتەوە سەر باری دەروونی ، کۆمەڵی ، ئابووری ، تەنانەت پەروەردەی منداڵیش ، ئەمەیان زیاتر لای (هێمن) سەرهەڵدێنی ، ناهومێدی ، لە ماڵ لە خێزان لە کۆمەڵە دواکەوتوو لە کەساسی‌و بێ‌کەسی‌و هەژاری‌و ئەرێتی کون‌و تەکیە‌و خانەقا دەیان شتی‌تر وای‌لێ‌کردووە پەنا بەرێتە بەر پیاڵەو ساغەر وەکوو (ئەبولنواس) دەڵێ :

**رأیت اللیالی مرصدات لمدتی**
**فبادرت لذاتی مبادره الدهر (١)**
دیسانە دەڵێ :
**الراح شیء عجیب انت شاربه (٢)**
**فاشرب وان حملتك الراح اوزارا**
**یامن یلوم علی حمراء صافیه**
**صر فی الجنان ودعنی اسكن النارا**

ئەو شاعیرانە دەیانەوێ بە مەی خۆیان سڕ بکەن تا ئێش‌و ئازاری ژیان کەم بکەنەوە ، لەلای ئەو شاعیرانە دوو ڕای سەیر سەیر بەدی دەکرێ : یەکەمیان : ژیان ئەوەیە کە تێدا دەژین ، بەڵکوو شانۆیەکی (کاریکاتیرە) ، هۆشمەند ئەو کەسەیە تا لە ژیاندایە بخواو بخواتەوەو تامو چێژی لێوەربگرێ!! دووەمیان ژیان تاڵێ‌ی بەنرخە ، بەختەوەری لەوەدایە کە

مانای ژیان بزانێ‌و هەوڵی بۆ بدەی‌و لێ‌ی‌تێبگەی .

هەرچۆنی بووبێ ، هێمن کاتێ باسی (مەیی) و (مەیخانە) دێنێتە گۆرێ لەو باوەڕەدا ینم کە ویستوویێتی بەو بابەتە زەمینەیەك بەرپابکات ، چونکە شیعرەکانی تری، بەربەرچی ئەوە دەدەنەوە . لەبەر ئەوەش ، دەتوانین بڵێین جیاوازیێکی هەرە گەورە لە نێوان ( هێمن‌و بێ‌کەس‌و سەلام) شاعیرە یاخی‌یەکانی تردا هەیە وەکوو (ئەبولنواس) . هەرچەندە لە گەڵ (خەیام)دا زیاتر تولفەت دەگرن‌و دەگونجێن .. ئەگەر بێت‌و سەرنجێکی ( چارە نووس شاعیر ) بدەین دەبینن بە چەند دێڕێکی (غەزەل) سەرەتای باسەکەی دەکاتەوە ، : ( بەهار ، هاوین ، زستان ، پایز ، یارو خونجە ، باران‌و هەور، گریان‌و فرمێسك، چارشێوە، ڕوویەند ، کولم قژی خاو ، روومەت و ردیف ، خەم‌و خەفەت ، کەسەرو دەردو عەزرەت ، تاکوو بە حەسرەت کۆتایی بەم چیرۆکە دێنێت . کە ئومێد لە ناو نا ئومێدی‌دا دەدۆزێتەوە دەیەوێ ئەو تەونانە کە دەورو بەری پێ چنرابوو رزگاری ببێ . ئایا هێمن توانیویە ئەو دۆزینەوەیە وەدەستبهێنێ کە دەڵی:

**سۆفی کونجی خانەقا بووم ئێستە**
**پیری مەیکەدەم**
**زاهیدی خەلوەت نشین بووم ئیستا**
**مەست‌و مەیزەدەم**

هەرچەندە پیرە زاهیدە ، ریش بۆزە ــ وەکو خۆی دەڵێ ــ ڕێگای ( تصوف )ی وون کردووە ، خۆی لە مەیخانەی ژیاندا دۆزیوەتەوە ، کەچی بە هەنسکەوە ، باسی (سۆفی)یەتی دەکات و هەناسە هەڵدەکێشێ . لە ناخەوە لە گەڵیا گڕ دەگرێ‌و دەسووتێ .. بۆیە ئەو (ماکە) سۆفی‌یە لە شیعرەکانی‌دا بەدی دەکرێ کە دەڵێ :

**هونەر ناتوانێ جوانی تۆ بە هیچ**
**شێوەیەك بنوێنێ(١)**
**لە مەڕمەڕ چۆن دەتاشرێ هەیکەلی**
**ئەم بەژن‌وبالآیە**

ئا ، سەیری ئەو (توحد)و (تحدا)یە بکەن ! کە تەحددای هەموو هونەرێك دەکات . چونکە ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك ، خۆی بنوێنێ‌و هەیکەلی ئەو بەژن‌و بالآیە لە مەڕمەڕ بتاشێ !! تەنیا ئەو خوایە نەبێ کە بەو پەنجەو خامەی نەقشی دەکات‌و دەینەخشێنێ ؟ !

**ئایا ئەمەیان ئەوە ناگەیێنێ کە ماکی (سۆفی)گەرێتی لە شیعری هێمن‌دا بووبێ‌و مابێ ؟! لێرەدا شیعرەکەی (گۆران)م دێتە گوێ (جادە چۆڵ‌و سێبەر بوو ) تا دەگاتە ئاستی ئەوە شتێکی جوانتر بڵێت کەچی زمان لەنگ دەبێ ووشە دەتاسێ‌و ناتوانی چۆن ئەو هەست‌و نەستی خۆی دەربڕێ ناچار پەنا دەباتە بەر میتافیزیق کە دەڵێ ( خوایە هێزی ئینشایە ) ! .. ووتمان جیاوازیێکی ئاشکرا لە نێوان شاعیران‌دا بەدی دەکری . بە تایبەتی لە نێوان(هێمن‌و بێ‌کەس)دا. یان (هێمن‌و سەلام)دا ، یان ( هێمن و قانیع)دا یان لە نێوان (هێمن‌و خەیام)دا . کە ئەمەیان زیاتر مەبەستە ، هەرچەندە هەردووکیان لە یەك سەرچاوەدا یەك دەگرنەوە کە پەنا بردینانە بۆ مەیی و مەیخانە.**

کەچی خەیام بە پێچەوانەی (هێمن)ەوە لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە ویستوویەتی لەم ژیانە یاخی بێ، چونکە ژیانێکی بێوەرە ، مرۆڤ ناگاتە ئەنجامێکی ئەو تۆ ، و ، لەم گەردوونە بگات ؟ خەیام دەڵێ : هاتنی مرۆڤو دەرچوونی بەم شێوەیە واتە چی ؟! خەیام لە روانگەی فەلسەفەوە دەڕوانێتە دەورو بەری . هەرچەندە(هێمن)یش لەو بیرکردنەوەیە بێ بەش نیە ، بەڵام زیاتر پەنا دەباتە بەر (مەی)و هێرش دەکاتە سەر ( جەنابی شێخ ) هەرچەندە لێرەدا ناگاتە پلەی (نالی، محوی ، حاجی قادر کۆیی ، قانیع، بێ‌کەس .... ) لە باس‌کردنی سۆفی ریش پانو بناگوێ ئەستوور ، چونکە هێمن زۆر کەم لەو بوارەی داوە سەرەڕای ئەوەی کە شارەزاییەکی تەواوی لەو بارەیەوە هەیە چونکە پەروەردەی تەکیەو خانەقایە .. ( لە دەرفەتێکی تردا باسی لێوە دەکەین ) . بۆیە دەڵێ :

وەبەر من نایەڵێ لێرەش مەیو
ساقی ، جەنابی شێخ (١)

**دەنا لەولا شەرابو حۆری با هەر بۆ**
**جەنابی با**
**هەموو عوری ئەبەد تێ‌یدا نیە**
**خۆشی دەمێك مەستی**
**خەو ناوی حەیاتی بۆچبو و؟ فێری**
**شەرابێ با**

یاوەکوو دەڵێ :

**بە ڕیشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم بۆ**
**جەمالی تۆ**
**ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کەپیربوو**
**تازە دانایە !**

شاعیری ئەسیلو ڕەسەن بە بەهرەیەکی هەرە ڕەسەنەوە دێتە مەیدان ، لەگەڵ سەقافەتێکی پانو فراواندا ، تێکلاوێ دەکات ، پێیان دەڕوانێتە ژیان ، لە گەڵ هەستو نەستی جیهانی ناوەوەیدا هەڵیان‌دەشێلێو بە هونەرمەندانە ئیحساسێکی قووڵی دەداتێ کە بە ڕیشی بۆزەوە سوجدەی بۆ دەبات !!

خەیام دەڵێ :

**من دا من زهدو توبه طی خواهم کرد**
**با موی سفید قصد می خواهم کرد**
**پیمانه عمر من بهفتاد رسید**
**این دم نکنم نشاطی کی خواهم کرد**

واتە (دامێنی سۆفی‌یەتیو تۆبە دەپێچمەوەو بە سەری بۆزەوە بەرەو مەیخانە هەنگاو دەنێم . ئێستاش تەمەنم گەیشتۆتە حەفتا ساڵ ئەگەر لەم تەمەنەدا گورجو گۆڵ نەبمەوە ئەی کەی گورج دەبمەوە ؟ )

خەیام بەسەری سپی‌یەوە بۆ مەی سوجدە دەباتو گروگاڵ دەکات (هێمن)یش بە ریش بۆزەوە بۆ یارەکەی سوجدە دەبات ! دێرە شیعرە کەی هێمن کە دەڵێ :

**سۆفی کونجی خانەقا بووم ئیستە**
**پیری مەیکەدەم**
**زاهیدی خەڵوەت نشین بووم ئیستا**
**مەستو مەیزەدەم**

ئەم جۆرە شیعرە گەر براوردبکرێ لەگەڵ شیعرەکانی (خەیام) و (سەعدی‌و حافز) دا ئەوا بۆمان دەردەکەوێ تا چ ڕادەیەك (هێمن) (متأثرە) بەو شاعیرانەوە و سوودی لێیان‌وەرگرتووە ؟ !

هێمنو خەیام لە چەند خاڵێكدا یەکدەگرنەوەو جیا دەبنەوە . ئەگەر بێتو لە شیعرەکانی (خەیام) وورد ببنەوە دەردەکەوێ کە لەسەر ریبازێکی فەلسەفی ئەڕواتو هەنگاو دەنێ : سروشت ، مادە ، ڕۆمانتیك ئەبیقۆر ، ئەفلاتوون ، (لاادری) و ( دەهری )و ئەستێرەگەریو ماتماتیك ، سۆفی‌گەرێتیو پیری مووغانو کونجی مەیخانەگرتن کە پەیتا پەیتا لە مەیکێڕ داوادەکات . چونکە تەمەن کورتە !!

بەلام هێمن ناوبانگی فەلسەفی‌یانەی بە خۆیەوە نەگرتووە تەنیا وەکوو شاعیرێك نەبێ کە سوودی لە کەلەپووری ئیسلامیو فارسی وەگرتووە بۆیە هێمن لە نێوان دوو فەلسەفەدا دەژی کە هێشتا لە هیچ لایەکیان بۆ ساغنەبۆتەوە . واتە هێمن نە ماددی‌یانەو نە میسالی‌یانە بیردەکاتەوە ؟ !

دەگونجی بۆوترێ: پیرێکی زاهیدی خەڵوەتخانە لە گەڵ پیرێکی‌مەیخۆری مەیخانەدا یەك دەگرنەوە ؟! هەر وەهاش دەگونجێ هێمن متأسر بێ بە (خەیام)ەوە . چونکە هەردووکیان سۆفی مەزەب بوون ، هەردووکیان خاوەن ئەزموونو تاقی‌کردنەوەیەکی گەورەن ، هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆی تەعبیر لەکاتو شوێنو بیرو باوەڕی خۆیان دەکەن !

هەرواش (هێمن) لە گەڵ (بێ‌کەسو سەلام)دا نزیك دەبێتەوە ، (بێ‌کەسو سەلام) هەردووکیان لە بابەتی مەیو مەیخانەدا خاوەن ئەزموونن .بەڵکوو زیاتر سوودی لە

هەردوو شاعیرە نەمرەکەی وەرگرتووە ، بەڵکوو سیمای شیعری بێ‌کەس‌و سەلام‌و قانیع‌و تەنانەت حاجی قادرو محوی‌و نالیش‌یان پێوەدیارە . بەڵام لەوان لە باسی ئافرەت‌و جنس‌دا جیادەبێتەوە چونکە بیرکردنەوەی ئەبیقوورانە وا لە هێمن دەکات کە لەژێر پەردەوە زۆرشت لەو بارەیەوە بدرکێنێ کە دەڵێ ‌:

**رەدیفیش تێك‌بچی پێم خۆشە من**
**دەستم لە مەمدابێ(١)**
**وەرە با هەڵمژم ئەو لێوە شیرینە بە**
**کەیفی خۆم**

مەبەستمان لێرەدا ووشە ( ردیفیش تێك‌بچی ) یەیە . واتە ئەگەر هاتوو تلپی تەڕیش تێدا ئەما ئەوا شاعیرمان هەر هەناسەی بۆ هەڵدەکێشێ بە دوای نیوەکەی خۆی دەگەڕێ بە نیازی ( توحد)ی جینسی‌یەوە . ئەمەشیان لە رایەکانی فەیلسوونی (اللذة) (ئەبیقوور)ە هەرچۆنی بووبێ هێمن هەقی خۆیەتی ، سەربەستە لە بیرکردنەوەدا ، خۆ دەیتوانی رێگای مزگەوت‌و تەکیەو خانەقا بەرنەدات، دەیشتوانی ڕێگای مەی‌و مەیخانە بگرێتەبەر ، بۆشی هەیە هیچ لەم دوو ڕێگانە نەگرێتە بەر !!! بەڵام پەنابردن بۆ مەی زیاتر ئەوەمان بۆ جەخت دەکات کە بارە ناهەموارەکەی ژیانی زێتر پاڵی پێوەناوە . ئەدەی چۆن ئەو سۆزو بەزەیی‌و ئێش‌و ئازارو نامۆیی‌و ئاوارەیەی تێربکا !!

لە ناو پیاڵەو ساغەرو لوێچی دەست وێنەی خۆی ببنێ !! وە بەو جۆرە بڕوانێتە ژیان ! بەڵام ئایا هێمن ڕۆژێ لە ڕۆژان (تۆبە) لە مەی دەکات‌و دەگەڕێتەوە ؟ وەکوو (خەیام)و (ئەبولنواس) پاشەکشێ‌کەر لە هەموو کردەوەکانی‌و کە چۆن کەوتە پارانەوە :

**دب فی الفناء سفلا وعلوا**
**واراني اموت عضوا مفضوا**
**لیس من ساعة مضت لی الا**
**نقصتنی بمرها بی جزوا**
**ذهبت جدتی بطاعتی نفسی**
**وتذکرت طاعة الله نضوا**
**لهف نفسی علی لیال وایام تملتهن**
**لعبا ولهوا**
**قد اسانا کل الاساه فاللهم صفحا**
**عنا وغفرا وعفوا**

بەم جۆرە (ئەبوللنواس) دەبینین پیر دەبێ ، تافی لاوێتی کز دەبێ ، ئاوور لە ڕابووردوو دەداتەوە ، هیچی بەرچاو ناکەوێ لە هەناسە ساردی زێتر بۆیە ناچار ـ لە ترسانا ـ پەنا دەباتە بەر (خوا)و لێی دەپاڕێتەوە !

بەڵام هێمن بەرەنکاری مردن دەبێتەوەو پاڵ بە (شەیتان)ەوە دەنێت‌و ئەو شەیتانە چ جۆرە رەمزێك بووبێ !

**سەروی ئازادیش لە بارو دلکەش‌و**
**جوانە بەڵام**
**گیانەکەم من شێت‌و شەیدای لارو**
**لەنجەی ئەم قەدەم**

لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێ :

**سیبەری مەرگم لە پێش‌دایەو بەرەو**
**مەنزڵ دەڕۆم**
**ناخی گۆڕی تەنگە جێگەم هەر**
**تلاسایی قەدەم .**

**من بەرەو ئاسۆ بەرەو روناکی باڵم**
**گرتووە**
**چون بەرەو تاریکی دەخشم پاڵ بە**
**شەیتان دەدەم**

ئیمجا بە دێرێکی‌تر مەبەستەکەی دەدرکێنێ‌و دەڵێ :

**ئاگری سینەم بلێسەی دێ وولات**
**رۆشن دەکا**
**ئەو دەمەی خۆم وەك دڵۆپێك دەچمە**
**نێو دەریای عەدەم**

تا لە باسەکەمان دوور نەکەوینەوە ، دەڵێین لەبەر ئەوەشە شاعیرە مەیخۆرەکانمان بەجوانی هەست‌و ئەستیان لەناو قالبی شیعری تەڕو بەردا داڕشتووە بەتایبەتی (بێ‌کەس، سەلام، هێمن) . بێ‌کەس دەڵێ :

**ساقی دەخیلە بمدەرێ جامی(١)**
**با لەعالەمی ماددە بەدەربم**

ئەگەر بێکەس ئەو شیعرەی لە ساڵی ١٩٤٣ دا وتووبێ لەوانەیە (هێمن) لە هەڕەتی لاوێتی‌دا ئەو شیعرانەی خوێندبێتەوەو (متاثر) بووبێ بە شیعری‌کانیەوە . بی‌بێ‌ی بۆچوونی خۆی لەپێشەکی‌ی دیوانەکەی‌دا کە چۆن لاسایی شێخ ڕەزای کردۆتەوە هەرواش لەوانەیە هەوڵی ئەوەی ئەوادابێ لە شاعیرەکانی تریشمان سوودی وەرگرتبێ . بۆیە رەنگ‌و سیمای شیعری ( سەلام‌و بێ‌کەس )و شاعیرانی ترشیمان بەشیعرەکانی (هێمن)ەوە دیارەو بەڵکو بە ئاشکرا ڕەنگ دەدەنەوە ـ ئەم بابەتەش‌خۆی لە خۆی‌دا لێکۆڵینەوەیەکی دەوێ هێمن دەڵێ :

**شەوانە هاونشین جامی بادەم (٢)**
**بە بادە با پەژارەو غەم بە با دەم**
**کەدەستی رۆژگار بایدا سەری من**
**سەری شووشەی شەراب واچاکە**
**بادەم**

هێمـنی شــــاعیر ، لێرەدا وورده‌کاریەکی جوانی داهێناوە ، جناسێکی رێك و پێکـی بەکـــار هێناوە . بە تایبەتی لە نێوان وەشەی (بە بادە)و (بادەم)و (بـــە بادەم)دا هەریەکە جۆرە مانایەکی تایبەتـــی خۆی هەیە .. بەم توورەیی‌یی هێمن لەوەدایــە ، غەڵوغەشی دڵو رقو کینــــەی لـــە بادانی ســـەرە شووشەکەدا دادەمرکێنێ ! دەڵێ :

**ساقیا کوشتمی خـەمو مەینەت**
**دەوەرە لەو شەرابە مەستم کە(١)**
**نامەوێ جامو ساغەر و پیالـــە**
**بەشی خۆ بۆ لە لوێچی دەستم کە**
**وەرە ئەی نازەنین بە خێرا خـــۆت**
**گێو وێژم بکە بـە بادەو مەکـ**
**با منی رەنجەڕۆ لـــە ژینـم دا**
**هیچ نەبێ جارێك بڵێم ئۆخـەی**

ئەم پارچە شیعرەی لە ساڵی ١٩٥٧/١٣٢٦ دا ووتووە . بـــەم جۆرە پەنا دەباتە بەر مەیێ . ئارام ناگرێت تاکو ساقی بە بادەوە بکاتە لای ، پیالەو ساغەری بۆ پڕ بکات بەڵکوو زۆر بە پەلەیە ! لە ( یادم بکەن)دا غوربەتەکەی زاڵ دەبێ ئەگەر بە یادکردنیش بووبێ ئـــەوا تۆزێ دەحەسێتەوە کە دەبێ :

**لەو دەمەی دا پیالە دەدرێن لە پیالە**
**لەو دەمەی دا لێوتان بەبادە تاڵە(٢)**
**لەو دەمەیدا کۆڕی شادی دەبەستن**
**لەو دەمەیدا سەرخۆشیو مەستی**
**مەستن**

جگە لەو هۆیانە کە باسکران ، هۆیەکی تریش هەیە کە هێمن پەنای بردۆتە بەر مەیو مەستی ئەوەشیان سەردەمی لاوێتی‌یەتی، کە هەناسەی لە دوێدا دەکێشێ کە دەڵێ :

**وەرە ئەی نازەنین بە خێرا خۆت**
**گێژ و وێژم بکە بە بادە و مەی**

ئایا ( هێمن)ی شاعیر دەزانێ مەی زیاتر ناخی مرۆڤ دەخواتـــەوە ؟ بێ‌گومان بەڵام لـــەزەت لـــەو خواردنەوەیەش وەردەگـرێ ( بارە دەروونی‌یەکەی مەبەستە ) بۆیە قوم لەســــەر قوم . ژەم دوای ژەم . جورعە دوای جورعە چونکە ( شاعیر لەزەت لەئێشو ئازارەکانی ، ئیلهام وەردەگرێ . دەوای دەردەکانی تێدا دەدۆزێتـــەوەو مەرهـــەمی دەکا)(١) زیاد لەوەش ( کاتێ ئێشو ئازارەکانی دەروونی شاعیر ، تاڵان دەکـــەن ، ئەو ، لە باتی ئەوە ، تامو چێژیان لێ وەردەگرێ ! ئەمەش ، ئـــەوە دەگەیێنێ کــە بە هۆی ئەوەوە ، ئیلهام وەردەگرێ . وە لە گـــەڵ ئیلهامدا هەست بە جۆرە خۆشی‌یەك دەکات واتە : « معاناة » رێگایەکە ، بۆ ئیلهام ، بە واتایـــەکی‌تر ، بۆ داهێنان ! داهێنانیش، وەسیلەیەکە، کـــە ئازارەکان بخرێنـــە ژێـــر رکێفیەوە و تامو چێژ وەرگرتن ، ئەگەر ئێشو ئازار نەبوایە ئیلهـام نەدەبوو ( ئیلهام)یش نەبوایە ، تامو چێژو لەزەتیش نەدەبوو)(١) .

هـــەروەکوو لە لاپەڕەکانـــی پێشـــوودا باسمان کرد . ئەوەنەبێ (هێمن)ی شاعیر تەنیا شا ، سواری ئەم مەیدانەبێ ! ئەسپی خۆی لـــە گۆرەپان (عەرەسەی) مەیخانەدا تاو دابێ ، بەڵام بەردەوام بوونی هێمنو تێکلاوکردنی ئەم بابەتە لەگەڵ بابەتە شیعری‌کانی‌دا بۆتـــە هۆی گرەو بردنەوەی دەبا گوێ لە (سەلام)ی شاعیر بکرین بزانین دەڵێ چی :

**لــە بەحری تاڵی دنیــــادا ژیاوم**
**ئەژیم تا گیانی شیرین دێتە سەر**
**لەب(٢)**
**ئەوەی ئێمرۆ لە لای خەلقی موهیمە**
**لە لای من قەشمەری و گاڵتە و**
**گەپ**

لێرەدا ــ سەلام ــ دەیەوێ بــە گوێ‌نەدان ، ئەو ژیانە بەرێتەسەر وانە لایەنە گوێنەدانەکەی (لاابالی) زاڵ دەبێتە سەر فیکرەکەیدا چونکە تێگەیشتووە کە ژیان بەتاڵەو هیچو پووچە ! ئەوەشیان تأسیری شیعری (خەیام)ی لەسەرە . بەڵام ( هێمن ) سوورە لەسەر خەمو گریان ، چونکە خەمو خەفەت لە خەلوەتخـــانەی ئەودا نامەحرەم‌نییە ! کەچی (سەلام) لە سکالایەکی شاعیردا دەڵێ :

**بێ‌بەش لەو دنیادا لەم بەری(١)**
**ئەو دەردی سەری ئەم کویرەوەری**

**ساقی شەرابێ بێنـــە فرسەتە**
**ژیان گاڵتەیە دنیا قەشـــمەری**

سوخریەتەکەی (ســـەلام) بـــە هیزترو تیژترە چونکە ژیان تەنیـــا قەشمەری نیە !! لەزۆر شـــوێن‌دا ویستویەتی لاسایی (خەیام) بکاتەوە، بەو کارەش خزمەتی زمانو ئەدەبی کوردی کردووە . بەڵام کاتێ دنیا بە قەشمەری دادەنێ ئەوەمان دەخاتەوە بیر ئایا ژیان پێویســــتە بژینرێ ؟ هەرچەندە ئەمەشیان فکرەیـــەکی مەبەسی‌یانەی تێدایەو جۆرە باخی

بوونێکه . پەنابردنی (هێمن‌و سەلام) بەرمەی‌و مەیخانە لەبەر ئەوەیە کە لەم ژیانە بێ سەمەرەدا لە خەم‌و خەفەت بەدەر بن ئەوەش لە ئەنجامی نائومێدی خۆیان دوواکەوتنی کۆمەڵی کوردەواری بووە . هێمن دەڵێ :

**شەوانە هاونشین جامی بادەم**
**بە بادە با پەژارە و غەم با دەم .**

(سەلام) لە ( ساقی نامەکەی)دا دەڵێ :

**فیدات‌بم ساقیا ئەی گیانی شیرین(۱)**
**مەڵێ کوانێ شەرابی مێوەی خوێنین ؟**
**پیالە پڕ بکە تۆ لەو شەرابە**
**منیش جەرگ‌و دڵم وێنەی کەبابە .**

کەچی (هێمن)ی شاعیر لە شیعری تووڕی‌دا زۆر بە پەلەو بە پاڕانەوە داوای مەی دەکات ، چونکە ئەگەر بیزانیبا ئەنجامی تێگەیشتن کوێرەوەری‌یە شەق تیهەڵدانە دەربەدەری‌یە خۆی لەو ڕۆخەنەدەدا مادام شتەکە وای لێهاتووە چار چی‌یە ؟ دەبێ عیلاجەکەی مەستی‌و شێتی‌و نەزانین بێ ! دەڵێ :

**دەزانی بۆچی من هێندە پەریشان و خەفەت بارم**
**لە بازاری ژیان غەیری هونەر نیمە چ سەرمایە**

بیخود دەڵێ :

**ئەوی دانایە جەرگی وەك پەلاسە**
**ئەوی نادانە نازانێ چ باسە**

هێمن دەڵێ :

**حاسڵی تێگەیشتن‌و زانین**
**چبوو بە من جگە لە کوێرەوەری**
**سەردەمێکیش پەنا دەبەم بۆ مەی**
**تا بزانم چلۆنە بێ خەبەری**

یان دەڵێ :

**بە توو تووش ، تووشی مەکتەب**
**بۆ دەهاتم من کە زانیبام**
**خەفەت، مەینەت، کەسەر،**
**حەسرەت، بەشی ئینسانی زانایە !**

بەم شێوەیە دەبینن شاعیرانمان **تووڕە دەبن بە پێچەوانەوە** ئازارەکانیان دەردەبڕن ، ئەو ئاخ‌و ئۆخەو دادو تووڕەیە هەموو دەگەڕێتەوە سەر نائومێدی‌یان کە پەیوەندیەکەی هەرە بەهێزی هەیە لە گەڵ باری کۆمەلایەتی‌و ئابووری روشنبیری‌و بۆیە لە ناوە ناوەیەکدا پەنایان بردۆتە بەر ئەو دیاردانەیە بە خەڵکی ڕادەگەێنین کە دواکەوتنی کۆمەڵ نەزانین‌و نەخوێندەواری‌یە . هەندێ لەو شاعیرانەش وەکوو (هێمن‌و بێ‌کەس‌و سەلام) لە ئەنجامی تووڕە بوونەوەکەیاندا پەنایان بردۆتەبەر مەی‌و مەیخانە وەکوو باسمان‌کرد. بەم جۆرە دەبینین هێمن لەگەڵ مەی‌و مەستی‌دا ( تعامل ) دەکات‌و پوختتر بەرەو بابەتەکەی دەکشێ . کەچی (سەلام‌و بێ‌کەس)یش کاتێ پەست‌و تووڕە دەبن یان دەست‌کورت دەبن یان باری کۆمەڵی ناهەموار کاریان تێدەکات بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکانیان پەنایان بردۆتە بەر مەستی .

بێ‌کەس دەڵێ :

**هەقمە گەر ئارەق بخۆم تو خوا**
**رەفیقان لۆمەم مەکەن**
**زەحمەتە بێ مەیی ژیانم یەم**
**دڵەی تاریکەوە .**

ئەو شیعرەی لە ساڵی ۱۹۳۹دا وتووە ..

(۱) دیوای سەلام ل۷ .
(۱) دیوانی سەلام ل۹ .
(۱) التفسیر الفنی للادب .
د. عزالدین اسماعیل‌ص۲۹ .

**بەلەناوبردنی نەخوێندەواری بنیاتنانی سۆشیالیستیمان پتەو دەبێت**



# گرنگی و دەوری فێرکردنی گەوران لە پەرەسەندن دا

نووسینی : د. محمد منیر مدرسی

فێرکردنی گەوران یان بەتەمەنەکان کە لە نیوەی سەدەی بیستەوە لە کۆنگرەی ( سینور) کە لە دانیمارك سالی ١٩٤٩ و لەپاش ئەمەش بە دەسالێك لە کۆنگرەی مۆنتریال لە (کەنەدە) کە لە سالی ١٩٦٠ دا گیرابوو گۆڕانێکی گشتی بە خۆیەوە دیوە نێوان ئەم دوو کۆنگرەیەدا بیرو ڕاو ریبازی گرنگ بۆ فێرکردنی بەتەمەنەکان گەلاڵە بوو و هاتە کایەوە .

کۆنگرەی سینور ( خاکی ) بیانە دەی ڕوانییە فێرکردنی گەورانو لای وابوو بریتی‌یە لە هێنانە دی ئاواتو پێویستەکانی گەوران لە هەموو ڕوێکەوە .. کۆنگرە بۆ فێرکردنی بەتەمەنەکان چەند ئامانجێکی دانا لەپێش هەموویانەوە هێنانەدی دادی کۆمەلایەتی لەنێوان خەڵك داو پەرەپێدانی لەیەك گەیشتنی جیهانیو رادە دانان بۆ ئەو جیاوازی‌یەی کە لە نێوان بەشێکی کەمی روشنبیرو کۆمەڵانی خەڵك دا هەیە هەروەها پەرەپێدانی هەست کردنی تاکە کەس بەئەندامەتی‌ی کومەڵ چەرخێك دا کە نرخو نەریتە باوەکان شلەژاوون هەرچی کۆنگرەی مۆنتریال بوو ئەو بۆ فراوان کردنی مانای فێرکردنی گەورانو دارشتنی بناغەکانی لەسەر چەند بنەڕەتێکی زانیاریانەی پشت بە بەرنامەی ئایکولوجی بەسترو ڕیگای خۆش‌کرد بەم چەشنە مەبەستی فێرکردنی گەوران لە چوارچێوەیەکی تەسکی باوەوە کە بریتی بووە لە بەرنامەی ئێوارانی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە ڕێزی



بەتەمەنەکاندا دەرچوو بۆئــــەوەی مەودایەکی زیندوو تێهەڵکێش بـــە پێویستەکانی کۆمەڵو تاك بکرتێەوە. هەروەها کۆنگرەی مۆنتریال ریگەی بۆ ئەو تیگەیشتانە خۆش‌کرد کە لــە کۆنگرەی تارانی ساڵی ١٩٦٥ هاتنە کایەوە کاتێ کە کۆنگرەیەکی جیهانی بۆ نەهێشتنی نە خوێندەواری لــێ بەســـتراو وەزیرەکانی پەروەردەو فێرکردن تێیدا بەشدار بوون لـــە سەرووی ئەم بیروڕا تازنەش بــیری نەهێشتنی نەخوێندەواری پێشەیی بوو لە چوارچیوەی بەتەمەنەکانــدا هەروەکو پێویستە ئەوەش بزانــین کــە بیری فێرکردنی پیشـــەیی وە نەبێت کۆنگرەی تاران دای هێنابێت بەلکـــو لـــە مێژەوە مێشــکی پەروەردەکــەرانی پێوە خەریك بووە بۆ نزیك کردنـــەوەی فێرکـــردن لەژیان . کۆنگرەی ( طوکیو ) ش ساڵی ١٩٧٢ لەســـەر ڕۆشـــنایی بیروڕای فێرکردنـــی هەمیشـــەیی روانیە فێرکردنی گەوران وە بـــە چالاکیەکی سەرتاپای ژیانی دانا ، جارێکی تریش ئێمە دەلێن کەبیری فێرکردنی هەمیشەیی ئەویش لـــە داهێنانی کۆنگرەی ( طوکیو ) نیـــە بەلکو بیرێکی کۆنە وەکو ریشەی لە کۆنەوە لەناو تەقالیدەکانی ئیـــسلامیدا دا کوناوە ئەم گوڕانانە رەنگدانەوەی سروشتی دەولەتییـــانەی فێرکردنی بەتەمەنەکانە بەم پێیە کە مەیدانێکی زیندووی گرنگە گەلانی پێشکەوتووو پەرەستێن پێکەوە بەتەنگیەوە دێن .

**( ڕێبازی ئایکولوجی بۆ فێرکردنی گەوران )**

مەبەست لە ڕێبازی ئایکولوجی بۆ فێرکردنی گەوران ئەو ڕێبازەیــە کە بەپیویــستی دەزانێ گەورەکان لە ژیانگەی خۆیاندا فێربن چوونکــە مرۆڤ بە شێوەیەکی ئەندامیانە بــە ژیانگەی خۆیەوە بەنــدە . بۆ پێی دەڵێن ڕێبازی ئایکولوجی کە ئەمەش ئەو بارو دۆخەی ژیان دەکۆڵێتەوە کە گــەورەکان تیابـــدا فێر دەبنو هـــەوڵدەدا ئـــەو گیروگرفتـــە راستەقینانـــە بزانێـــت تا بتوانن بەسەریان دا زاڵ بن . بـــەیارمەتی ڕێبازی ئایکولوجـــی دەتوانـــین فێرکردنی گەوران لەسەر بناغەیکی زانیاری راست هەڵچنین چوونکـــە بەهـــوی ئـــەوەوە دەتوانـــین پێویـــستەکانو بایەخو ئارەزوو پاڵ پیوەنەرەکان و ریشەی روشنبیری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی خوێنـــــدن خوازە گەورەکان بزانین ، هەر وەکو دەتوانین پیویستیە روشنبیری‌یـــە کانی ژیانگەش بزانین . تێکرا بەهۆی ئەم زانینەوە کە لەهەموو روویەکەوە پەیدا بووە دەتوانین کە سنوور بــۆ ئامانجی فێرکردنی گەورانو پەیڕەو و بەرنامـــەکانو کەرەســـتەکانی فێرکردنی بکێشین هەروەکو دەتوانین بەهۆیەوە ڕیگەی زانیاری گونجـــاو هەڵبژێرینو سوود لە تەکنولوجیای تازەی فێرکردن وەربگرین ئـــەوی شیاوی باسە ئـــــەم بەرنامـــەی ئایکولوجی‌یە لە پرۆژەکانی رابەردا بۆ نەهێشـــــتنی نەخوێنـــدەواری پیشـەی‌یە لە چەمەری بەرنامـــەی جیهانی تاقی‌کردنەوەیی نەهێشـــتنی یەخوێندەواری بەکار هێنراوە .

**هۆی بەتەنگەوە بوونی فێرکردنی گەوران**

بۆچی بایەخ بەفێرکردنی گەوران دەدەین ؟

هۆی ئەم بەتەنگەوە بوونە چی‌یە ؟ ئایا فێرکردنی گەوران ئەم هەمـــوو بەتەنگەوە بوونە دەهێنێ ؟ یا وەکو دەڵێن فێرکردنێکی لاڕێ‌یی‌یە ؟ ئایا هۆی تەواوی هەیە کـــە بڕوا بکەین کە ئـــەوەی بۆ فێرکردنی گـــەوران تەرخانی ئەکەین لە رووی ئابووری‌و کۆمەلایـــەتی‌یەوە جێگایی خـــۆی دەگرێ ؟ یاخود ئەو پارەو پوولـــەی کە لەم مەیدانەدا خەرج دەکـــرێ بەفیرۆ دەروا کەپێویـــستە لـــە مەیدانێکی تری زنیاری‌دا بەخـــش بکرێ .

بەراســـتی فێرکردنی گـــەوران جێگایەکی گرنگ‌و روو لە زیاد بوون لە مەیدانێکی زیندووی وەکـــو



مەیدانی پەروەردەدا داگیر دەکا جگە لە دەستەوتی کۆمەلایەتیو ئابووری ئەم چەشنە فێرکردنە گەلێ هۆی بنەڕەتی ئەوتۆ هەیە کەئەم بەتەنگەوە بوونە بە پێویست دەزانن لە پێش هەموویانەوە :ــ

**١ ــ کەموو کووڕیی لە فێرکردنی گشتیدا :ــ** فێرکردن لە ولاتی عەرەبیدا وەکو پیشەسازییەکی گەورە وایە کەسالێ نزیکەی چوار هەزار ملیۆن دۆلاری تێدا وەبەر دەهێنرێو کەوا نزیکەی ٢٣ ملیۆن قوتابیو سێ چارەك ملیون مامۆستا دەگرێتەوە ، لەگەل ئەوەشدا فێرکردن لە ولاتی عەرەبیدا دووچاری کەمو کووڕیکی بەتین بووە لە رووی چەندایەتیو چۆنایەتی .

ئێمە ئەگەر براونینە قۆناغی سەرەتایی کە قۆناغی بەزۆر پێخوێندنە لە زۆربەی ولاتە عەرەبیەکاندا دەبینین کە نەختێك زیاتر لە نیوەی منالآن دەگرێتەوە کە ئەمەش ئەوە دەگەینێ کە کەمتر لە نیوەی (نزیکەی لە ٤٢٪) ی مندالآن لە دەرەوەی قوتابخانە دەمێنەوە کە ئەمە دەبێتە هەوێنێك بۆ کێشەی نەخوێندەواریو زیاد بوونی ، سەرەڕای ئەمەش ئێستا ڕادەی پەرەسەندنی فێرکردنی سەرەتایی هەر گیز لەگەل رادەی زیاد بوونی سالآنەی دانیشتوان ناگونجێ بۆیە ولآتە عەرەبیەکان ناتوان لە باشترین بارو دوخ دا بەرلەبیست سال بەزۆر پێخوێندنی تەواو بهێتە دی .. خۆ لە چاو فێرکردنی ئامادەیی ( ئانەوی ) یەوە ئەوا رەنگی ئەم کێشەیە زۆر ڕەشترێکە ، چونکە ئەم چەشنە فێرکردنە هەر چواریەکی لاوان دەگرێتەوە ئەوانەی کە لە تەمەنی قوتابخانەی ئامادەیی دان ئەوەی کە دەمێنتەوە جێگایان لە قوتابخانە کاندا نابێتەوە جگە لەمە کە فێرکردن لە قوتابخانە ناوەندیەکاندا بەم شێوەی ئێستا پێویستیو بۆ چوونەکانی لاوان ناهێنیتەدی کە لە ئەنجامدا تووشی سەرلێشیواندن دەبن هەروەکو بەهۆی کەمو کووری لە رووی چەندایە تێو چۆنایەتی وزەی ئادمیزاد بەفێرو دەبات وە تەرازووی ختنە ڕوو و داوا کردن لە بازاری کاردا تێك دەدا . بەلآم فێرکردنی دانیشکا لەبەرئەوەی کە سەرە پۆپەی فێر کردنە ئەویش ژێر دەستەی ئەو باوو یاسایا نەیە کە رێ لە توانای چەندیی دەگرن بۆ دابین کردنی ژمارە یەکی زورتر لە قوتابیان هەروەها توانای چۆنیەتیش لە رووی پەرە پێدانی ئابووریو کۆمەلایەتی داهاتوو بەشداری بکات . تابەم جۆرە دەبینین فێرکردن لە وولآتی عەرەبیدا لەپلەی جۆر بەجۆر دا تائێستا نەیتواینوە ئاواتەکانو بۆ چوونەکانی گەلانی عەرەب پێك بێنێ کە ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلێنێ کە بۆشاییەکی فێرکردن لە ئارادا هەیە . کە دەتوانرێ فێرکردنی گەوران یەكسەر بەشداری خۆی بنوێنێ بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە لەرێگای ئەو پرۆگرامو بەرنامە هەمە جۆرەیە کە پێشکەش دەکا کە زۆر بەباشی لەگەل پێویستیە رۆشنبیریەکان دا بۆ فێرکەران دەگونجێ هەر وەکو لەگەل بارو دوخو کارو توانایا ئەلوێت . بەلآم پیویستە ئەوە بزانین کەنابێ بەو چاوە سەیری فێرکردنی گەوران بکەین کە چارەسەرکردنێکی کاتییە وە مەبەست زال بوونە بەسەر فێرکردنی گشتیدا ئەم بۆ چوونە نا تەواوە . پێویستە بەوچاوە براونینە فێرکردنی گەوران کە بریتییە لە ئامادەکردنی مرۆڤ بۆ چوونە نلو ژیانێکی باشو بەشدار بوونیتی لە گەشەکردنی کۆمەل . هەروەکو فێرکردنی بەتەمەنەکان لەروویکیترەوە دەوریکی پشتگیری دەنوێنێ لە فێرکردنی رەسمیدا .

**٢ ــ بلاو بوونەوەی نەخوێندەواری :ــ**

نەخوێندەواری دیاردەیەکی شارستانییە پەیوەندی بەتینی بە دواکەوتنی رۆشنبیرییەوە هەیە بەمانا ئەنترۆپۆلۆژییەکەی لەلایەکی تریشەوە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی ئەو دواکەوتنە . نەخوێندەواری لەولآتی عەرەبیدا کێشەوە کەندو کۆسپێکی گەورە دورست دەکا لەرێگەی پێشکەوتنی ئابووریو کۆمەلایەتیو بەراستی ئەم کێشەیە لەڕووی قەبارەوە کێشەیەکی گەورەیە بەلای کەمەوە دوو بەش دانیشتوانی دونیای عەرەب دەگرێتەوە لە رووی دابەش کردنی جغرافیا وە ئەم کێشەیە لە دێهاتەکان دا زیاترە تا شارەکانو لەسەر بناغەی توخمیشەوە نەخوێندەواری لە ناو ئافرەتاندا زیاترە لە پیاوان واتە ئەو بەشەی کە نەخوێندەواری خۆی تیا حەشار داوە ، بریتییە لە بەشی ئافرەت لە ناوچەکانی دێهاتدا دوای ئەمە بەش پیاو دێ لە دیهاتەکاندا دەتوانین پشت بەم راستیانە ببەستین ئەگەر بمانەوێ قەلآچۆی نەخوێندەواری

بکەین هەروەکو لێرەدا نیشانەی ترمان هەیە ئەگەر بمانەوێ بیخەینە بەرچاو . پێویستە بڕوانینە فێرکردنی گەوران بەو شێوەیە کە نەهێشتنی نەخوێندەواری نیەو بەس . هەرچەندە کە ئەمەش کۆڵەکەیەکی گەورەیە بۆ فێرکردنی گەوران بەتایبەتی لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتوەکاندا . شایانی باسە نەهێشتنی نەخوێندەواری دوو لای هەیە ، یەکێکیان لای خۆ پاراستنە ئەویش بەربەست کردنی سەرچاوەی نە خوێندەواری‌یە کە ئەمەش بەهێنانی هەموو منالان دەبێت بۆ بەزۆر فێرکردن لە قوتابخانە سەرەتاییەکان داو مسۆگەر کردنی هەموو شتێك کە دەبێتە هۆی بەربەست کردنی دورکردنەوەو دەوام نەکردن لە قوتابخانە کاندا .

دووەم لای چارەسەرکردنە کە بریتی‌یە لە فێرکردنی ئەو نەخوێندەوارانەی کە لەکاتی خۆیدا نەیان توانیوە بخوێنین کە لە رۆشنبیری بێ‌بەش بوون هەرچەندە گوتراوە ( خۆپاراستن لە چارەسەرکردن باشترە ) بەڵام نەهێشتنی نەخوێندەواری لە ولاتی عەرەبیدا پێویستە لەسەر هەردوو شێوە بڕوا بۆ ماوەیەکی درێژی داهاتوو کە بێگومان کە لە بیست ساڵ کەمتر نابێ .

**۳ ــ بوونی ژمارەیەکی زۆر لە هێزی کارگەری نەشارەزا : ــ** ولاتە عەرەبیە کان وەکو دەوڵەتانی بەرەستێنی تر لە بارو دۆخێکی نا هەموار دان بەگوێرەی پێکهاتنی هێزی کارگەرەوە چونکە زۆربەی ئەم هێزە نەخوێندەوارەو کە مێکنی بریتی‌یە لە هێزێکی شەرەزایی خاوەن تاقی‌کردنەوە کە فێرکردنی گەوران دەتوانی دەورێکی گەورە بنوێنی لە هێنانە دی سەر لەنوێ دامەزراندنی ئەم هێزە کارگەرە لەشارەزایە لە رێگەی پرۆگرامی فێرکردنو شارەزایی جیاوازەوە کە لە ئەنجامدا لە نرخی چۆنیەتی ئادەمیزادی ئەم هێزە زیاد دەکا کە لە دواییدا دەتوانی دەورێکی کاریگەر بنوێنێ بۆ پاڵ پێوەنانی رەورەوەی گەشەکردنی بەرهەم هێنان .

**٤ ــ پێویستی زیادبوونی مشق پێ‌کردنی بەردەوام بۆ هێزی کارگەران : ــ** پێی ناوێ بڵێین کە ئێمە لەم چەرخە زوو بەزوو گۆرینەدا ئەژین هەر رۆژە شتێکی نوێ‌و هەمەرەنگ لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی وەتەکنیکی‌دا روو دەدا کە لە دواییدا سەر دەکێشێ بۆ گورینی بەگوێی شێوەی کارو بەرهەم هێنانیش تەنانەت پێویستە لەسەر ئەو بەشە شارەزای‌یەی هێزی کارگەران کە سەر لەنوێ شارەزایی خۆی زیاد بکا تا بگونجێ لەگەڵ داوای زیاد بوونی ئەم گۆرینە تەکنەلوژیە خێرایە بێگومان داوای شارەزایی هەمیشە بەرەو زیادی ئەروات‌و لە سنورێکدا راناوەستێ بۆیە فێرکردنی گەوران لە چوارچێوەیەکی هەمیشەیی‌دا بە کارێکی پیویستی سروشتی چەرخی ئەمرۆ دادەنرێ دیارە ئەم راستیەش دەولەتە عەرەبیەکان ئەگرێتەوە بۆ وێنە : لەئەژماری ساڵی ( ۱۹۷۵ ) دا دەرکەوت کە ۲ر۷٦ ملیون کەس تەمەنیان لە نێوان ۱۵ ــ ٦٤ واتە ۵ر۵۲٪ لە دانیشتوانن . ٤ ملیونیان لە کاردان واتە ۱ر۲۷ وا چاوەروان دەکرێ کە هێزی کارگەر لە ساڵی ۲۰۰۰ بگاتە ۸۰ ملیۆن ئەمەش بریتی‌یە لە زیاد کردنی ئەبرەی کار بە هەموو شێوەیە کە ئەمەش بەشداری فێرکردنی گەورانە لە گەشەدانی ئەم هێزە لەگەڵ ئەو دەورەی کە لەپێشدا نیشانماندا کە کوکردنەوەی هێزی کاری نەشارەزایە .

**۵ ــ زیاتر بە ئەنگەوە بوونی دانانی یاسا بۆ پاراستنی منداڵ و ئیش نەکردنیان لە تەمەنێکی بچووك دا : ــ**

بەئەنگەوە بوونی دەوڵەتە عەرەبیەکان بۆ دانانی یاسا بۆ پاراستنی منداڵ‌و ئیش نەکردنیان لە تەمەنێکی بچوکدا بەرەو زیاد بوون دەروا جا ئەم منالانە یا هەر لە ئەوەڵەوە نەچوونەتە بەر خوێندن یان پاش ساڵ‌و دوو ساڵی وازیان لە خوێندن هێناوە بەهۆی نالەباری بارو دۆخی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی ، بۆیە ئەمانە نەخوێندەوارن‌و گەلێ جار لەئشوکاری سووك‌و نزم یا رێگای سەخت‌و ناخۆش ئەگرن‌و دەبنە شاگردی پیشەیی کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەفێرو چوونی سامانی ئادەمیزاد لە کۆمەڵدا بەراستی بوونی یاسایەك کە رێ لە منداڵ بگرێ کە ئیش نەکا دەبێتە هۆی ئەوەی کە پالی پێوە بنرێ بۆ مەیدانی فێرکردن کە مەیدانێکی گەورەو فراوانە . بەم چەشنە فێرکردنی گەوران بەشداریەکی باش دەنوێنێ لە گەشە پێدانی ئەم سامانە مرۆڤایە تیە سەرهەڵداوەو دەبێتە هۆی شارەزایی یەکی زانیاری‌و بە کردەوە بۆ ئەوەی لە دواییدا بتوانن بچنە بازاری کارەوە کە دەگەنە ئەو تەمەنەی دەشێ کار بکەن . هەر وەها پێویستە لەسەر فێرکردنی

گەوران کە وازیان لێ نەهێنێ و وەکو بەتەمەن گەورەکان لە کۆمەڵی زۆر نوو گۆڕاوی گەوراندا خەمی فێرکردنیان بخوات .

**٦ ــ زۆر لێکردنی بە کارهێنانی شێوەی دیموکراتی لە فێرکردندا :ــ**

فێرکردن لەوە دەرچووە کە خۆشیەك بێت و بەس بەلکو پێویستە کە لم پێویستە کانی ژیان واتە بۆتە مافێکی بنچنەیی مافی ئادەمیزاد کە پەیمانەکانی مافی ئادەمیزادە دەولەتان دانی پیاناوە کە بەندی یەك لە مادەی ٢٦ لە پەیمانی جیهانی بۆ مافەکانی ئادەمیزاد کە لە سالی ١٩٤٨ دەرچووە پاش دیموکراتیەت گەورەترین سەرکەوتنی بەدی هێنا دەلێت ( هەموو مرۆڤێك مافی خوێندنی هەیەو پێویستە فێرکردن لە قوناغا فێرکردنەکانا یەکەم بنچینەیی دا بەلای کەمەوە بە خۆرایی بێت هەر وەکو پێویستە فێرکردنی سەرەتایی بە زۆری بێتەو فێرکردنی هەنەریو پیتسەیی دەرگای کرابێتەوەبەکشتیو فێرکردنی بالآ مسۆگەر بێ بۆگشت. هەر وەکو شێوەی دیموکراتی لە فێرکردندا کارێك ئەکا کە ئافرەتیش مافی فێربوونی هەبێ هەرچەندە ئەم مافە بە قسە دانی پیانراوە بەلام هێشتا نەکەوتۆتە بازاری کارەوە . ئەوە هیچ بە دیموکراتیەت دانانرێ کە بەشێ لە کۆمەل بێ بەش بکرێ لە خوێندن یا ئەم دەستەیە بێ بەش بکرێن لە روشنبیری ئەگەر ئێمە باوەرمان بە دیموکراتیەتی راستی بێ لە فێرکردندا ، پێویستە دەرگای فێرکردن بۆ گشت بخینە سەر پشت بێ گوێدان بە رەنگ . تەمەن توخم و بیرو باوەر بەم چەشنە فێرکردنی گەوران دەچێتە شێوەیەکی دیموکراتیەتەوە ئیمە زیاد نالێین ئەگەر فێرکردنی گەوران بریتیە لە پێکهیانی دیموکراتیەتی فێرکردن چونکە فێرکردنی رەسمی لەم مەیدانەدا کەمو کوڕی پێشان داوە بە هۆی ئەو نەرێتو پروگرامو یاسایانەی کە لە سەری رویشتوە.

**(( فێرکردنی بە تەمەنەکانو پەرەپێدان ))**

دیارە ووشەی پەرەپێدان لەو ووشانەیە کە بە زۆری لەم سالانەی دوایدا لای پیاوانی پەروەردەو ئابووری بەکار دەهێنرێ کە ئەم بەئەنگ هاتنەی هەردوو لا کارێکی وای کرد کە لێکۆلینەوە لەسەر پەیوەندی فێرکردن پەرەپێدان لە هەر چوار لاوە بدا لێکولینەوەی کۆنو نوێ ئەوەیان بۆ ئاشکرا بووە کە فێرکردن دەورێکی گەورە دەنوێنێ لە گۆڕینی کۆمەلایەتیو پەرەپیدانو پێك هێنانی بەرزی بەختیاری کە ئێمە بەم جۆرە شێی ئەکەینەوە .

ئێمە مافی ئەوەمان هەیە بپرسین مەبەست لە پەرەپێدان چیە . بەراستی دەتوانین بلێین کە پەرەپێدان بەسادەیی مانای گەشە کردنو هەلدانە بەو رێگایەدا کە خۆمان دەمانەوێ بە نموونە زیاد کردنی بەرهەم هێنان کارێکی پەرەپێدانە بەلام زیادی لە کارکردن بەکارێکی پەرەپێدان دانانرێ چونکە لە لایەکەوە هەروا کە خۆمان نامانەوێ پێویستە ئەم قسەیە زۆر بە پارێزگاری یەوە بکرێ چونکە پەرەپیدانێك کە خۆمان ئەمانەوی نیسبیەو بەگوێرە جیاوازی پلەی پەرەپێدانی و بارو دۆخی ئابووری کۆمەلاتیەوە دەردەکەوی .

زیاد کردنی دانیشتوان جاری وا هەیە رێگایەکی دروستە وە لە دەولەتیکدا کە پێویستی بەکارگەران بێت وەکو یەکیەتی سۆڤیەتو ئەلمانای یەکیەتی هان ئەدرێت وا دیارە لە دەولەتێکي تردا رێگایەکی دروست نیە کە پەرەپێدانی ئابووری ناگونجێ لەگەل زیاد کردنی دانیشتوانی کە لەدوای دائەمزیادیە ئەبن بەبار بەسەریەوە وە لەلایەکی تریشەوە زیاد بوونی لە کارکردن دروستە لە کومەلێکداو نا دورستە لە کۆمەلێکی تردا بۆ وێنە ژاپۆن نزیکترین دەولەتە کە هانی ئیستداکی ناو خۆیی ئەدا پاش ئەوەی کە ئەرازوی بازرگانیەکەی زیادە یەکی زۆری پێوە دیار بووە . لێرەدا نیشانمان زۆر هەیە کە دەتوانین بیکەین بە بەلگە بۆ پەرەپیدانو پیوانی رادەکانی وەکو زیادەی هەمیشەیی لە داهاتی نەتەوەیی ( الدخل القومي ) و ئەنجامی نەتەوەوەی گشتی هەر وەکو بەردەوام باش کردنی پلەی ژیان لە هەموو روو یەکەوە : تەندروستی ، فێرکردن ، کۆمەلایەتی ، هەر وەها پەیوەندێکی توند هەیە لە نێوان پلەی پەرەپێدانو چەشنی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە بەکار دەهێنرێ کە ئەمەش نیشانەیەکە بۆ پەرەپیدان .

تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو هەمیشە لەگەل پلەی پێشکەوتووی پەرە پێدان دا ئەگونجێ و یەکێك لەو باوەرە چەوتانەی کە بلاو بووەتەوە ئەوەیە کە تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو بەکار بهێنرێ بۆ خێرا کردنی گۆڕینی کۆمەلاتیەك کە هێشتا لە قوناغی

بەکەمی پەرەپێدان دایە ئەمەش یە رووکەش دائەنرێ چونکە پێویستە تەکنەلۆژیای بەکار هێنراو زۆر نزیك لە داروباری کۆمەلایەیی‌و ئابووری‌و روشنبیریە ئیەوە بێت . هەروەکو پەرەپێدان بەگشتی بەمانای پەرەپێدان بێ‌گیرانەوەو لە هەموو سووچیکەوە بەکار دەهێنرێ جاری واش هەیە لە سنوورێك دا مانای دیاری کراوە وەکو دەڵێن پەرەپێدانێکی روشنبیری یا کشتوکاڵی یا پیشەسازی یا دێهاتی یا ئابووری کۆمەلایەتی هەرچەندە زۆر گرانە کە پەرەپیدان جیا بکەنەوە لە مەیدان مەوداکانی لەبەر تێ‌هەڵکێشی کار کردنی ئەم لەسەر ئەو بەلام ئەم جیا کردنەوەیە زۆر جار بۆ ئاسان کردنی لێکولینەوە زانیستانە پێویستە چونکە پەرەپێدان لە مەودای فێرکردن‌و روشنبیری‌دا پەیوەندی بەپەرەپیدانی ئابووری‌و کۆمەلایەتیەوە بەوپێ‌یە کە فێرکردن بەرهەمێکی ئابووری‌و کۆمەلایەتی هەیە ــ هەر هەمان شتیش لەنایەت فێرکردنی گەوران دەگوتری کە ئامانجی پەروەردە کردنی تاك‌و کۆمەڵە جیا پێویستە ئەسەر فێرکردنی گەوران بۆ ئەوەی ئامانجی خۆی بپێکێ یارمەتی تاکە کەس بدا کە دەوری کۆمەلایەتی هەمە جۆرەی خۆی بنوێنێ لە ناو خێزان کۆمەڵدا وە ئەم ئەرکە کۆمەلایەتیە هەلگری‌و کاتی بەتاڵی بە جۆرێکی بە کەڵك بباتە سەر بۆیە پێویستە بەرنامەی فێرکردنی گەوران هەمە رەنگ‌بێ کە بتوانێ بەرەنگاری ئەم داوا زۆرە تازانە بکات هەر چەندە کە تووشی گۆرینی هەمیشەیی دەبێت کاتێ کە دەچێتە تەمەنەوە فێری زۆر شارەزایی جیا جیا دەبێ پێویستە بەرنامەی فێرکردنی گەوران زۆر فراوان بێ تا گشت مەیدانەکانی پەروەردە بگرێتەوە کە لەپاڵ فێرکردنی خوێندنەوەو نووسین دەبێ روشنبیری گشتی‌و مەشق پێ‌کردنی پیشەیی‌و نەقابی‌و رۆشنبیری هەرەوەزی‌و سەرکردەیی‌و پەروەردەی تەندروستی‌و کۆمەلایەتی لەگەلابێ ــ لەبەر ئەوەی کە داخوازی فێرکردنی گەوران لەزیادی دایە لەم چەرخە گۆراو گۆرەدا پێویستە چەند دام‌و دەزگایەکی نەتەوەیی پسپۆر بێتە کایەوە کە بتوانی بەرمانەی فێرکردن بهێنێتە دی : ــ

## فێرکردنی گەوران‌و زیاد کردنی داهاتی نەتەوەیی

به ووشەیەکی سادە داهاتی نەتەوەیی بریتی‌یە لە تێکرای داهاتی خەڵکی ، ئێمە ئەگەر بەو چاوە بڕوانینە داهاتی تاك کە بنچینەی داهاتی نەتەوەی‌یە ئەوسا بۆمان هەیە بڵێین کە هەموو زیاد بوونێ لە داهاتی تاك دەبێتە هۆی تێکرا زیاد کردنی داهاتی نەتەوەیی لەگەل بە بەر چاو گرتنی هەندێ هۆی‌تر کە لەم مەیدانەدا کار دەکەن ئاشکرایە کە لە کۆمەڵی توانایی‌دا داهاتی تاك بەپێ‌ی شارەزایی‌و زانیاری تاك دەپیورێ جا لێرەدا گرنگی فێرکردن دەر دەکەوێ لە زیاد کردنی داهاتووی نەتەوەیی دا . لەم لێکولینەوەیەدا ئەم راستیەمان بۆ دەسەلمێنێ لەوانە لێکولینەوە کانی میللرو شونتر کە دەریان خستوە کەرادە داهاتشان بەشانی زیادکردنی پلەی فێرکردن دەروا هەروەکو لێکولینەوەیەکی ترمان هەیە کە دنسون کردویەتی کە گەیشتوەتە ئەوەی کە لە ٢١٪ ی پەرە پێدانی ئابووروری کە لەوولاتە یەکگرتوەکان لە نێوان سالانی ١٩٢١ ــ ١٩٥٧ دەگەرێنەوە سەر کاری فێرکردن . هەروەها لیکۆلینەوەکانی سوفیەت دەری خەن کە بەیوەندیکی بەندیکی بەتین هەیە لەنێوان پەرەپیدان ئابوری‌و فێرکردن ، پاش بوونی بە بەردەوامی پلەی فێرکردنی کرێکاران پەیوەندێکی توندی بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی یەکیەتی سوڤیەتەوە هەیە ، بۆیە ٧٥٪ رادەی زیادەی سەر تاپا لەبەرهەم هێنانی پیشەسازی یەوە لە پلانی حەوتەی ئەم دوایی یەدا لە بنچینەدا دەگەرێتەوە بۆ چاکردنی چۆنیەتی فێرکردن‌و راهێنانی پیشەیی کە کرێکارانی سۆڤیەت لەم بیست ساڵەی داویی یەدا پێکیان هیناوە .

## فێرکردنی گەوران‌و بەرەپێدانی هێزی کارگەر

سامانی مرۆڤ بابەت بە کۆلەگەیەکی پێشکەوتنی ئابوری‌و کۆمەلایەتی کۆمەلەکان دادەنرێ بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەی کە فێرکردن بە خزمەتێکی کۆمەلایەتی دادەنێت رۆژ بەرۆژ ئەو راستیە دەر دەکەوێ کە فێرکردن بریتی‌یە لە وە بەرهێنانی سەرچاوەکانی مرۆڤ بابەت بەلکو ئێستا بە گرنکترین بووارەکانی وە بەرهێنان دادەنرێت کە هیچ بووارێکی تر نایکاتی‌و ئەمرۆ فێرکردن بووە بە پیشە سازی‌یەکی گەورە لەم چەرخەدا وەبەبێ کەم کردنەوەی دەورەکانی تری ئەو دەورەی کە ئەمرۆ ئەی نوێنێ لە ئامادە کردن‌و بەرە پێدان‌و راهێنانی هێزە مرۆڤیەکاندا

داخوازیکی بنچینەیی دروستە پێویستە لە نێوان پێویستەکانی کۆمەڵ بەهێزی کاریگەر لەگەڵ باری فێرکردنی لە هەموو پلەجیاکاندا ڕێگەیەك ساز بکرێت وە لە ئەنجامی گۆڕینی خێرا بە خێرایی تەکنەلۆژیاو فراوان بوونی کاری پەرەپێدان ، چوار چێوەی هێزی کرێکاران و ناومرۆکیشی هاتە گۆڕین لەبەر ئەوە پێویست بوو فێرکردن بەگشتی و فێرکردنی گەورانیش بەتایبەتی لەگەڵ ئەم گۆڕان و داخوازیانە دا بگونجێت بەکێك لە ئەرکەکانی فێرکردن بەرەنگار بوونی ئەو پێویستیە زیاد بانەی هێزی ئادەمیزادە لە پلەی جیا جیادا بەم چەشنە ( هاربیون ) دەڵێ پێکەوەنانی شارەزایی باڵا کلیلێکی ئالتونە بۆ کردنەوەی دەرگای پەرەپێدانی ئابووری لە دەولەتە پێشکەوتووەکان و تازە پێشکەوتووەکان دا . پێویستە نەڕوانرێتە پەرەپێدانی سامانی مرۆڤ بابەت بە تەنیا لە رووی پیشەیی هاو پەیوەند بە کارەوە چوونکە ئەم بۆ چوونە تەسكو کەم مەودایە پیویستە فراوان بکریت تاکو لەگەڵ ئەمەش دا رۆشنبیرکردنی گەشیش بکرێتەوە کە ئەمەش بۆ هەموو پەرەپێدانێکی مرۆڤ بابەت ئێجگار کاریگی پیویستە چونکە چاو کردنەوە بیان فێرکردنی گشتی بەشداری خۆی ئەلوێی لە پەرەپێدانی هێزی کرێکاران بە چەشنێکی بەردەوام و دابەش کراو . خوێندن بارمەتی دەرە بۆ پەرەپێدانی فێر کردن و توانای ڕاهاتی تاکەکان جا هەردووکیان : فێرکردن و توانای ڕاهاتن بارمەتی تاك دەدەن بۆ پێشکەوتنی بەردەوام لە کاریدا وە ئەم توانا گشتیە دەگەرێتەوە بۆ زانین و ئەو شارەزاییەی لە تاقیکردنەوە دا بەدەستی هێناوە هەروەکو دەگەڕێتەوە بۆ بنچینە زانیارییە پیویستەکانی زانستی و تەکنەلۆژیاو بەکار هێنانە کانیان . هەروەها فێرکردن دەبێتە هۆی بەرز کردنەوەی پلەی خۆزگەو ئاواتەکانی کریکاران بۆ پێکهیانی ڕێڕەوی ڕاست بەرانبەر خۆیان و کرێکاران و بەرامبەر سەروکەکانییان و ژێردەستەکانیان بەرانبەر پە کۆمەڵ بەگشتی ئەمانە گشتی دەبێتە بارمەتی دەر بۆ ئامادەکردنی چوارچیوەی گشتی و بیری کۆمەلایەتی بۆ پێکەهاندنی هێزی کرێکاروو لەرێوە بڕونی .

## فێرکردنی گەوران و پەرەپێدانی دێهاتی

فێرکردنی گەوران دەورێکی گرنگ دەنوێنێ لە پەرەپێدانی دێهاتی بەتایبەتی لە دەوڵەتەکانی دونیای سێیەم دا کە ئەمانە دەوڵەتی تازە پێگەیشتوون ئەوەی ئاشکرایە کە پەرەپێدانی دیهاتی بەتەنگەوە بوونێکی زیادی ئەوێ لەلایەن ئەو دەولەتانەوە کە زۆر لەسەرو سامانی خۆیان بە کارهێناوە بۆ فێرکردن و پەرەپیدانی دێهات بەو نیازەی کە بابەخی ئەم کارە لە پێش پەرەپیدانی شارەوە دێ .

لە نیمچە کیشوەری هیندی ئەم ریبازە لە دروشمی شورش سەوزدا خۆی دەنوێنێ کەوا مەلبەندی فێرکردنی گەوران دامەزرا بۆ پەرەپێدان بە دێهات لە زیاتر لە (١٠٠) ناوچە بەیارمەتی (یۆنسکو) و ریکخراوی خواردەمەنیو کشتوکاڵی .

ولاتە عەرەبیە کان لەم بارەیەوە وەنەبێ کەمتر بەتەنگ پەرەپێدانی کشتوکالی دێ و ئەمەش مێژوویەکی درێژی هەیەو ئەم خۆ بەتەنگەوە هاتنەش لە هاریکاری دەوڵەتەکان لەگەڵ ڕێکخراوی ( یۆنسکو ) دا خۆی ئاشکرا ئەکات کاتێ کە مەلبەندی پەروەردەی بنچینەیی لە ( سرس الیان ) وەکو ناوچەی کەنداو ( خەلیج ) کۆنگرەی سێیەمی وەزیرانی پەروەردەو ئەخشەی ئابووری لە ولاتە عەرەبیەکاندا کە لە ( ابو ظبی ) لە ماوەی ٧ ــ ١٦ نۆڤەمبەری ١٩٧٧ دا گیرا بریتی بوو لە لێکولینەوەی ئیستراتیجی تازە لەبارەی دیموکراتیەتی فێرکردن . کۆنگرە کە لە دەوری ئەم دوو ئامانجە دەسووڕامەوە : ــ

● فێرکردن لە پێناوی کرێکارانی بەرهەم هێنەردا .

● فێرکردن لە پێناوی پەرەپێدانی دێهاتیدا .

لەو یاسایانەی کە دانرابوو لە پەرەپێدانی دێهاتی بریتی بوو لە بەتەنگەوە بوونی سەرەکی بۆ فێرکردنی گەوران وە قەلاچۆ کردنی نەخوێندەواری پیشەیی لە چوارچیوەی نەخشەکانی پەرەپیدانی دێهاتیدا هەروەکو کۆنگرە دوو باسی تری پێشاندا کە پەیوەندی بە فێرکردنی گەورانەوە هەیە بەکێکیان دەربارەی فێرکردنی گەوران بەو پێیە کە دەربرینە لە دیموکراتی فێرکردن و یەکسانەیی . دووەم لەبابەت فێرکردنی گەوران بەو پێیە کە تۆڵە کردنەوەیە بۆ ئەوانەی خوێندنیان تێپەر بووە .

پەرەپێدانی دێهاتیش پەیوەندیە بە دامەزراندنو نیشتە جێکردنی کۆچەرەکانەوە هەیە .

### فێرکردنی گەوران و پەرەپێدانی کۆمەلایەتی

تێکەیشتنی ( پەرەپێدانی کۆمەلایەتی ( سەبارەت بە سنوور بۆ دانانو دیارکردنی کێشە لە گۆرێ دا هەیە هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە سەر نا ئاشکرایی وشەی کۆمەلایەتی ، جاری وا هەیە کە بەکار دێت هەموولایەکی روشنبیری ، تەندروستی، ئابووریی، سیاسی ، نەریتو خوو رەوشتو شتی تری کۆمەل دەگرێتەوە جاری واش هەیە هەر بۆ لایەنەکانی کۆمە لایەتی بەکار دێت واتە بەندە بە پەیوەندی کۆمەلایەتی نێوان خەلکەوە . شایانی باسە وەکو لەسەرەوە باسمان کرد زەحمەتە لایەنەکانی پەرەپێدان لە یەك بپچرنو جیابکرێنەوە چونکە هەر یەکە بەندە بەوی ترەوەو ئەمیان کار دەکاتە سەر بەوی ترەیان ئەوی تریش هەر وەها . فێرکردنی گەورانیش دەورێکی گرنگی دەنوێنێ لە پەرەپێدانی کۆمەلایەتی کە ئەمەش لەلای خۆیەوە راستەوخو یا بەشێوەیەکی لابەلا کار دەکاتە سەر پەرەپێدانی ئابووریو زۆر قورسە کە بەرەپێدانێکی ئابووری ببێ ئەگەر پەرەپێدانێکی کۆمەلایەتی لەگەلا نەبێ بە پیچەوانەی ئەمەش راستە ئێمەش دەتوانین بە هیوای چارەسەرکردنێکی زانستانەوە ئەو لایانەی پەرەپێدانی کۆمەلایەتییە دیاری بکەین کە فێرکردنی گەوران بەشداریان تێدا دەکات کە ئەمانەن :

**١ ـ بەکار هێنانی دروستی مافو پێویستییە کان :**

دیموکراتی راست لەسەر بنچینەی هاو نیشتمانی چاو کراوەوە دادەمەزرێ کە مافو پێویستی خۆی باش ئەزانێ هەر وەکو دەستووری دەولەتو یاساو قانوونەکانی ئەخاتە بەرچاو هەر ئەو ئەتوانێ ئەم مافو پێویستیانە بە رێگایەکی کاریگەر بەکاربێنێ بۆیە هەلسوراندن لەم بوارەدا پێویستە بەشێویەکی دیموکراتیانەو گیانێکی نیشتمانیانەی باشبێ بۆیە نەخوێندەواری کۆسپیکە لە رێگای پێکهینانی دیموکراتیەت ، هەروەکو تێکەیشتنی ئازادی لە چوارچیوەی دیموکراتی خۆی دا لە کۆمەلێکی نەخوێندمواری دوا کەوتوو لەرووی تەندروستیو کۆمەلایەتیو ئابووری یەوە باش راناگیرێ بۆیە ئەم قسەیەی کە ئەلێت هەر وەختی مرۆڤ خوێندموار بوو ئازادیشی پەرەسێنێ مانایەکێ پەروەردانەی گرنگ وەر دەگرێت .

**٢ ـ کەلك وەرگرتن لە خزمەت گوزاری کۆمەلایەتی :**

دەولەت بەو ئەرکەی گرتویەتیە ئەستۆ بەرانبەر خەلکی زۆر خزمەت گوزاری تەندروستیو فێرکردن ئەگرێتە ئەستۆی خۆی کە مەبەست بەرزکردنەوەی رادەی خەلکە بۆیە لەم پێناوەدا خەستەخانە دروست ئەکاو قوتابخانە و دەزگای هەمە جۆر ئەکاتەوە کە زۆر لە کاتو مالو رەنجی تیا خەرج کراوە کە ئەمانە گشتی هیچ بەرێك نادەن ئەگەر ئەو خەلکە کەلکیان لێ وەرنەگرن . بێگومان کەلکی تەواو لەم خزمەت گوزاریانە پێویستی بەرادەیەك لە تێکەیشتن لە لایەن هاونیشتمانەوە هەیە هەروەکو فێرکردنی گەوران بەشداری دەکا لەزیاد کردنی وریایی خەلك وپلەی هەستی کۆمەلایەتیان تا ئەم هەولو تەقەلایە ـ یان بەفێرو نەچن ـ

**٣ ـ پەرەپێدانی ریبازی راست :**

فێرکردنی گەوران دەورێکی گرنگ دەبینێ لە پەرەپێدانی رێرەوی راست لای خەلکی بەرامبەر زۆر شتی گرنگ کە پەیوەندیان بە بەختیاری کۆمەلو پێشکەوتنەوە هەیە کە بریتین لە رێزگرتنی ملكو مالی گشتیو پاراستنی سەرو سامانو رێکخستنی لە کارکردنو پاشەکەوتیو سنوور دانان بۆ منال بوونو بەتەنگەوە بوونی خوو نەریتی راست لە خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو خانوودا کە ئەمە گشتی رێرەوی راستی باشە لە پەرەپێدانی کۆمەلایەتی گەلاندا .

**٤ ـ جموو جۆلی کۆمەلایەتی :**

مەبەست لە جمو جۆلی کۆمەلایەتی لە رێرەوی کاریگەریدا پێش خستنی تاکە لە پلەی کۆمەلایەتیدا جا لەبەر ئەوەی کە فێرکردن لەوانە (فێرکردنی گەوران) دەبێتە هۆی زیاد کردنی هۆشیاری تاکە کەسو بەرزکردنەوەی نرخی ئادەمیزادیەتی ئەمە ئەبێتە یارمەتی دەرێ بۆ چاکردنی داهاتی پلەی ژیانی کە لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی زیاد کردنی ئاواتو خۆزگەی لە ژیانداو پێش کەوتنی بەردەوام لە پلەی کۆمەلایەتی دا بۆیە فێرکردن بە یەکێك لە هۆ گەورەکان دەژمێردرێ کە دەبێتە هۆی تواندنەوەی

جیاوازی چینایەتی و نزیك بوونەوە لە یەکتری‌و پێك هێنانی یەکیەتیەکی نەتەوایەتی‌و تۆکمەیی کۆمەلآیەتی .

## چەند هەنگاوێك بۆ گەشە پێدانی فێرکردنی گەوران

دیارە بە کەلکە ئەگەر بە کورتی لە چەند هەنگارێکی دیاری کراوەوە ئەو خالآنـە بخینە پێش چـاو دەربارەی ئەوەی کەچی پێویستە بیکەین لە پێناوی گەشـە پێدانی فێرکردنی گەوران لەولآتی عەرەبیدا کە لە سەروی هەموویانەوە ئـەم خالانەیە : ـ

١ ـ دانانی فەلسەفەیەکی ڕوون بۆ فێرکردنی گـەوران لەسـەر ڕۆشنایی ئامانجێکی روونی دیاری کراو .

٢ ـ پیاچوونەوە بە بەرنامـەی پەیرەوی فێرکردنی گەورانی ئێستاو کۆرینی لەسەر بنچینەیەکی زانیاری ورد .

٣ ـ پشـتگرتنی بەرنامـەی فێرکردنی گەوران بەهـۆی دام‌و دەزگای کۆمـەلی‌ی یاسـا دانان‌و میللی‌و ئاگادار یەوە .

٤ ـ زۆر کردنی کەرسـتەکانی فێرکردنی بنچینـەیی لەبار ، وە سەرپەرشت کردنێکی تێکەیشتووی فراوان کە شیاو بێت بۆ فێرکردنی گەوران .

٥ ـ زیادکردنی پارەی دەولـەت بۆ خەرج کردن لـە بەرنامـەی فێرکردنی گەوران کە بگونجێ لەگەل قەوارەی کێشـەکە هەروەها کەلك وەرگرتن لە سەرچاوەی پارەی نا دەولەتیش .

٦ ـ بایەخ دان بەپێگـەیاندنی ژمارەیەك لە کادیرانی فێرکردنـی گەوران‌و راهێنانیان کە بۆ ئەمەش پێویستە دانشـگاکانی عـەرەب بەتایبـەتی کۆلیژەکانی پەروەردە دەوری خۆیان بنوێنن لەم ئامادەیی‌و ڕاهێنانە دا .

٧ ـ دانانی بەرنامەی فێرکردنی گەوران لـەناو تویی بڕیارە کانی پروگرامـی کۆلیژەکانـی پەروەردەو دانشگای پێگەیاندنی مامۆستایان .

٨ ـ بایەخ دان بە لێکولینەوەی مەیدانی کە ئەملاو ئەولای فێرکردنی گەورانمـان بۆ ڕوون دەکاتـەوەو دەبێتە هۆی دامەزراندنی لەسـەر بنچینەیەکی زانیاری دروست .

## چەند پرسیارێك لەبابەت دەوری فێرکردنی گەوران

### لە دەولەتەکانی کەنداوی عەرەبدا لە ئارادایە

١ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری دەکا لە گواسـتنەوەی تەکنولۆژیا لە دەس کرێکارانی لـە دەرەوە هاتوو بۆ دەسـت هـاو نیشتمانان لە ڕۆلەکانی ولآت ؟

٢ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری ئەکات لە بەرێوە بردنی هێزی ئادە میزاد دا بۆ مـەودای کۆڕی کارو بەرهەم هێنان نەوەکو ئێستا کە بەرەو خزمـەت گوزاری ئەروا ؟

٣ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری دەکا لە تێکەل بوونـی کۆمەلە ئادەمیزادی لەدەرەوە هاتوو بۆ ئەو کۆمەلانەی کە تێیدا دەژین .

٤ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری دەکا لە چارە سەرکردنی ئەو کێشانەی کـە رەنگو بـۆی کەنداویان پێوە هەیە .. کە لەوانە کێشەی زۆری ئەو زمانانە کە قسەی پێ دەکەن ، بەدارستان کردنی بیابان و نیشـتەجێ کردنی کۆچەران .. پەرەپێدانی کشتوکال ، پێکەیاندنی کادیری ئادەمیزاد لە هەمـوو جۆرە مەیداندا ، بەتایبـەتی لە مەیدانی نەوت ، شـیرین کردنی ئاو ، وزەی رۆژ و کـەلك وەرگـرتن لێ‌ی .. گورجو گـۆل کردنی باری کـە شتیەوانی و چاکردنەوەی کەشتیان‌و راو کردن و پیشـەساز کردنـی ماسی .

٥ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری دەکا لـە پەرەپێـدانی کۆمەلآیەتی کۆمەلەکانی کەنـداو لەسەر روشـنایی ئاوات‌و ئامانجی گەلانی عەرەبدا .

٦ ـ چۆن فێرکردنی گـەوران بەشداری دەکا لە پێکەوەنانی سەر بەنەتەوەیی راست لای هاونیشتمانی عەرەبی خەلیج کە ئەمەش بریتی‌یـە لەسەر بەنەتـەوەیی‌و ئیسـلامی‌و مرۆڤایەتی جیهانیە .

لە گۆڤاری ( تعليم الجماهير ) ژمارە (١٤) ی سالی شەشی /١٩٧٩ وەرگیراوە بەپێنوسی دکتۆر ( محمد منير مرسي ) مامۆستای پەروەردە لە دانیشگای قەتەر .

# بانگەوازێك لە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراقەوە.. کۆڕێك بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی

بەدرێژایی ئەم سەدەیەی تیبدا دژەین‌و بەڵکو لە ماوەیەك پیشتریشەوە ڕۆشنبیرانی کورد خەریکی ئەوموون کارێك بکەن تیپە عەرەبی یەکان وا لێ‌بکەن بتوانرێ دەنگە کوردی‌یەکانیان بە جۆرێکی‌وا پێ‌دەربیردرێ خوێندەواری کورد بتوانێ ئەوەی بەدەمیا دێ بیخاتە سەر تاقز . لەم مەیدانەدا ڕووناکبیرانی کورد ، بە هەوڵی تاکە تاکەو بە کۆمەڵیان ، گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکان ، کۆڕو کۆمەڵە ئەدەبی‌و زانستی‌و ڕۆشنبیری‌یەکان ئەوەندەیان دەماغ سووتاندووە ئێستا ئێمە بتوانین بڵێین ڕێنووسێکی تاڕادەیەك باش ستانداردمان هەیەو تێکرا نووسەری کورد ئەگەر بی‌یەوێ دەستنووسێکی کۆن ڕاستکاتەوە ، کتێبی دانێ ، وتارێ بنووسی پەکی ناکەوێ ئێمە سەری قەدرو ڕێز لێ‌گرتن بۆ تێکرای ئەم سەربارە ناسراوو نەناسراوانەی ڕێگای دانانی ڕێنووسی کوردی دائەنەوێنین‌و یادیان لەسەر لاپەڕەی دڵمان بە خاوێنی ڕانەگرین .

بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا هەندێ بابەت ماوە کە چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە . لە ڕەوتی گەشەکردنی ڕێنووسی کوردیدا گەلێ بابەتی تریش هاتووەتە ئاراوە ئەوانیش هەروا چارەسەریان ئەوێ . بۆ ئەم بابەتازە بیروڕای جیاواز لە ئارادایەو هەر کۆمەڵە نووسەرێك ڕێبازێکی بۆ خۆی پەسەند کردووەو ، زۆریشیان لە یەك کاتدا بە زۆر جۆر ئەنووسن .

کۆڕی زانیاری کورد وەختی خۆی بڕیاری لە پارەی گەلێ لەو بابەتانەوە داو مەسەلەکەی بۆ ماوەیەك خستە بەردەستی خوێندەوارانبۆلێکۆڵینەوەو رادەربڕین لەبارەوە . ڕاستەکەی هەندێ کەسیش باری سەرنجی خۆیانیان دەربڕی . بەڵام مەسەلەکە لەم ڕادەیەدا وەستاو کۆر پێی نەکرا بیگەیەنێتە سەرەنجام و پێشنیارەکانیشی لە چاپە مەنی‌یەکانی خۆی بەولاوە بڕیان نەکرد . بۆیە ئەو گروگرفتانەی لە سەرەتای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کوردا لە پێش هەندێ بابەتی ڕێنووسی کوردیدا هەبوون ئێستاش هەر ماون‌و چاوەڕوانە چارەکردنن .

لێرەوەو ، لەبەر ڕووناکی دەسکەوت‌و پاشکەوتی نوو،دەستەی کوردی کۆڕیزانیاری‌عێراق مەداوە کۆڕێکی گوشاد لە حوزەیرانی داهاتوودا بو لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی ڕێنوسی کوردی لە یەکێ لە هەوارەکانی پارێزگای هەولێر ببەستێ‌و هەموو ئەوانەی بو بانگ بکا کە بەتەقەلا بۆ گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی‌یەوە خۆیان خەریك کردووە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەکی ئامادەکەری پێکهێناوە کە ئەرکی ڕێکخستنی ئەم کۆڕە بگرێتە ئەستۆ .

ئەم لیژنەیە ئەم بابەتایەی خوارەوەی کەڵاڵە کردووە کە لە کۆڕی ناوبراودا لێ‌یان بکۆڵرێتەوەو ، رایشی ئەگەیەنێ کەوا دەرگا لەسەر پشتە بۆ پێشنیار کردنی هەر بابەتێکی تر کە بەبیری ئەودا نەهاتبێ‌و خاوەن بیرانی بەڕێز بە پێویستی بزانن لێی بکۆڵرێتەوە . ئەمەش ناوو نیشانی ئەو بابەتانەی لیژنەکە دەس نیشانی کردوون :

**١ ـ گیروگرفتی نووسینی دەنگەکان :**

أ ـ ئەوانەی نیشانەدارن ( بزوێن‌و نەبزوێن ) .

ب ـ ئەوانەی پیتان بۆ دانەنراوە .

ح ـ پلەی دەنگە بزوێنەکانی ( و ، ی ) .

د ـ دیفتۆنگەکان ( وێ ، نگ ) .

**٢ ـ گیروگرفتی وشەی سادەو داڕێژراو :**

ا ـ ناوی عەرەبی .

ب ـ پێشگرو پاشگری ( پی‌ناسین ) و ( کۆ ) .

**٣ ـ وشەی ناسادە :**

ا ـ دیاردەی داتاشین‌و قووتدانی هەندێ دەنگ

ب ـ گیروگرفتی نووسینی ژمارەکان لە (١١) ەوە تا ( ١٩ ) .

**٤ ـ گیروگرفتی نووسین کردار لەگەل ڕاناو لە رووی پێکەوە ـ نووسان‌و پێکەوە نەنووسانەوە .**

**٥ ـ گیروگرفتی نووسینی ئامرازە لێکدەرەکان ( حروف العطف )**

**٦ ـ گیروگرفتی دانانی نیشانەکان .**

**٧ ـ گیروگرفتی چۆنیەتی نووسینی ووشە لێکدراوەکان لە بارەی پێکەوە نووسانن‌و نە نووسانننەوە .**

بۆیە تکایە لە ئێستاوە تا سەرەتای **مانگی نیسانی** داهاتوو هەرکەس ئەیەوێ لێکۆلینەوەیەك لە یەکێ یا زیاتر لەو بابەتانە یا لە هەر بابەتێکی تر کە خۆی پێشنیاری ئەکا ـ ئامادە بکا ، لیژنی ئامادەکەری کۆری ڕێنووسی کوردی لە بارەکای کۆڕی زانیاری عێراق ئاگادار بکات تا ناوی بنووسرێ‌و بخرێتە لیستەی خاوەن لێکۆلینەوەکانەوە بۆ ئەوەی دەستەی کوردی کوڕی زانیاری عێراق خۆیشی بتوانێ مشووری ئەو بابەتانە بخوا کە کەسێك هەلناکەوێ لێکۆلینەوەیان لەبارەوە ئامادە بکاتە .

ئێمەچاوەڕوانی بەشداری کردنتانین لەم کۆڕەدا ، بۆ ئەوەی کۆڕەکە لە ئاستی ئەو ئەرکانەدا بێ کە بۆیان ئەبەسترێ‌و ، بۆ ئەوەی بەتەقەلاو ڕەنجی هەوومان دوا کۆسپی ڕێکەی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی تخت بکەین .

**لیژنەی ئامادەکەری کۆڕی چارەسەرکردنی**
**گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی**
**لە جیاتیی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق**

**بغداد ـ الوزیریة ـ المجمع العلمی العراقی**
**الهیئة الکردیة ـ اللجنة التحضیریة**
**لندوة معالجة مشاکل الاملاء الکردی**

# یاری دووسەد سالەی ئەوشارەی بۆئێمە دەژی

لە هەوەلێن ڕۆژی سەرەتای ئاوەدان کردنەوەی ئەو زەوییەی لە سەری دەژین ، ئادەمی لەدایك دەبن‌و لە ئەنجامیشدا دەچنەوە دوو توێ خاك ، بە ئەندازەی بیرو لێکدانەوەیان لە کات‌و شویناندا لە خۆیان‌و لەدەورو بەریان ورد دەبنەوە ، زانیویانە کاروانی نێوان سکی دایك تا گۆڕ پێویستە بە خۆشی پێکەوە هەلکردن‌و پەیوەندی مرۆڤانە هەیە، بۆ هەلبژاردنی ئەو جۆرە ژیانەش دەبێ خەلکی لێك نزیك بن‌و گردبینەوە .

لە پێناوی هێنانە دی ئامانجی مرۆڤ کۆکردنەوەدا ، هەل‌و مەرجە بابەتی‌و تایبەتی خۆیان دەنواند ، لە پێشیانەوە هەستی زگماکی‌و سۆزی خۆشەویستی کەس‌و کارێتی ئەوجا زمان‌و دەبرین ڕۆلی مەزنیان بینی ، لەگەل ئەوانەشدا پەیدا بوونی خێزان‌و دروست بوونی کۆمەلێ مەرجی گونجاو بۆ پارێزگاری کردنی فەرمان‌و کار دابەشکردن‌و پاراستنە مافی هەر یەکەیان ، بەردی یەکەمی کۆمەلێکی گچکەلەی دانا ، دوا بەدوا سەپاندنی دۆخی نێوان خێزانەکان‌و چاکتر خۆشکردنی پەیوەندی کۆمەلایەتی‌و حوکمە دینامیکیەتی ژیان‌و مانەوەی بنە تۆو ڕەگەزی مرۆڤایەتی کاری وایان کرد چەند خێزانێك لە جێگاو پەنایەکی دلنیادا کۆببنەوە ، لەو کۆبونەوەیەوە «دێ» دروست بوو . ئەمە پێکەوە لە تەك پێشکەوتنە ئاستی هۆش‌و تێروانینە مرۆڤدا لە بەرەوپێش چوون‌و



گەورە بووندا بوو ، تاوای لێ هـــات پێداویستـــە مەزنەکان پێکهاتنی پەیوەندی فرە لایەنەی فراوانتری بەسەر خەڵکیدا راست کردەوە . ئاوەدانە لە «دێ» گەورەتر ، شارۆچکە، بە دوادا «شار» دروستبوون.

بە پێوانەی ژمارەی خانـوو بەرەو شـــەقام‌و کارگەو چڕی‌و قەرەباڵغە خەڵکی ، کۆمەڵ بەسەر دوو جۆردا دابەش دەکرێ ، یەکەمیان لادێ ، دووەمیان شار ، لە یەکەمیاندا دانیشتوانی لە دووسێ هەزارێك تێناپەڕێ‌و بە کشت‌وکاڵ‌و ئاژەڵدارییەوە خەریکن ، لە قەوارەی خانوودا بچکۆلەو سادە ، لە ڕووی داب‌و نەریتی کۆمەڵایەتییەوە ساکارو ئاسایە ، چۆنێتی ژیانی مرۆڤەکانیشی مام ناوەندی‌و هەشیانە نزمتر ، لەبارەی ڕۆشنبیری‌و هۆشیاری و تێڕوانینیان بەرامبەر ژیان‌و ئاستی بیرکردنەوەیان بە بەراود لەگەڵ شارستانـــدا کەم پەیوەندین‌و لە تەك کۆمەڵێ دێهاتە دراوسێ‌و یەك دوو شارۆچکەدا نەبێ هێندە هاموشۆیان نییە ، بەڵام دیاردەو رواڵەتەکانی شار لەوانە زیاتر پێشکەوتوو ترن‌و دەتوانین بەفراوانترو کاملتریان بزانین .

بەپێی ئەو سەرچاوە مێژووییانەی بە دەستمان گەیشتوون‌و لە ئەنجامی پشکنـــین دۆزینـــەوەی پاشماوەی دێرین‌و ئەشکەوتو ئاودێری کەلەولاتـــی ئێمەدا کراون ماونەتەوە ، کوردستان بەلانکـــەی مرۆڤایەتی‌و یەکێك لە هەرە شوێنە ئاوەدانەکانـــی جیهانی کـۆن دەژمێرێ ... زنجـــیرەی جەوهەری مرۆڤە کوردو دیاردە شارستانیەکانی لە گەلێـــك جاراندا بە زۆردارەکی پچێنراوە ، بەڵام ئەو دابرانە تا سەر نەبووەو ئاکام قوڵفەکان پێك گەیشتوونەتەوەو بۆ جارێکی نوێ خەبات بۆ خۆسەباندن‌و دروســـت کردنەوەی ژیان کراوەتەوە ،

هەروەك لەو گشت کۆمەڵو کەســانەی لــە بەرەبەیانەوە هاتوون ، بێ ژمارەیان ، بێ پاشماوەو ناو ڕۆشتوون‌و هیچیان لێ بەجێ نەماوە، ئێجگار کەمی کەمیان یادو جێ دەستیان بەجێ هێشتووە . بەو جۆرەش لە حساب بەدەر دێهات‌و شار لە بەیـــن چوون‌و لە یادی بیر چوونەوە ، کەمتر نشیان شان‌و شکۆی خۆیان پاراستووەو بەرەو پێش چوون .

لە میراتی نەتەوەیی میللەتی کوردا زۆر شتمان هەبووەو ناویان نەماوەو زانیارییەکی ئەوتۆمان لــە بارەیانەوە پێ نەگەیشتووە ، بە پێچەوانەشـــەوە گەلێك کەلەپورو سامان پارێزراون و گەورەیی‌و مەزنە کوردیان وەك حەقیقەتێکی مێژوویی‌و بوویەکی زیندوو لەگەڵ خۆیاندا هەلگرتـــووە ، لەپێش هەموویانەوە زمانی شیرینی‌کوردی‌و ئەدەبیاتە بە فەرەکەی . هەر لەباڵ ئەوانەشدا دیاردەی شارســـتانێمان لە زۆر شوێناندا ماونەتـــەوە وەك هـــەولێری بزورگ‌و ڕەواندوزی دیاری سۆرانمـــان‌و بتلیـــس‌و ئەرسیمی خۆشەویست‌و شارەزووری لەمێژینە .

لە چارەکی چوارەمی چەرخە هەژدەی زایینی‌دا ، بە تەواوتر لە سالی «١٧٨٤»دا ، بیری کامـــڵ‌و هەست بە خۆ دروستکردن‌و گەیشتن بە کاروانی میللەتان‌و بەنیازی مانەوە بە پێوە ، شاری هەڵمەت‌و قوربانی ، شاری شکۆدار ، شاری دیاری‌و یادگاری هەتا هەتایەی بابانەکان دروســـت کرا ، دروســـت کردنەکەشی هەر لەپێناوی شارو ئاوەدانیەکی ڕوتــدا نەبوو ، بەڵکو بۆ ئەوە بوو ببێتە شـــاری شاران‌و سەری ناو سەران‌و ئامانجە پیرۆزو ئێجگار گەورەتر ... بەڵام هەی موخابین ...

سلێمانی ، ئارەزووی ئاقە کەسەو هەرمەکێ نەی هێناوەتە وجود ، لە بەر خاترێ ئەم‌و بۆ چاوی کاڵی ئەو پەیدا نەبوو ، وەك ئەوە وا بووە لەم لاشەوە



به قسەكردنی « خاتوو مەلكە » و لە ترسە ڕۆژ هەڵاتو بۆ نزیك بوونەوەیەكی كوێرانە لە ڕۆژ ئاواو ئەستەمبوڵ نەبووە ، هەموو دڵنیابەو حەقیقەتە ئینسانی كوردو تاقی كردنەوەی مێژوویی یەوە ئەوانە نەبوون ؛ بەڵكو لە ئاكامی پێشكەوتنو گەشە كردنی لایەنەكانی ئابووریو كۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆشنبیریو پێداویستە كاتی چەرخ ، ئەو شارە سەر بەرزەی بنیات ناوە ؛ ئاسۆ گەشیو دووور ڕوانینو ئاواتو هیوای مەزن وایان كرد بناغەی سلێمانی لێ بدرێ . ئاوڕدانەوە لە كۆنو بەخۆدا چوونەوەو هەر چاوێك بە چەند چاوێك كردنو هەر هەنگاوێك بە چەند هەنگاوێك كردن مەلاشوی سلێمانیان هەڵدایەوە .. بەڵام كە ئامانج ئەو كاتە نەهاتێتە دی مانای نەمانی ئامانجو كڕوزانەوەی بێ دەسەڵاتانە نییە . چونكە وەك بەهار سروشت هەیە ، بەهاری ئاواتو تێكۆشانش هەیە ، كەواتە ئێمە دڵخۆشینو ئێمە بۆ هیوا دەژینو هەر هەوڵ دەدەینو لە ئاكامیشدا هەر دەگەینە جێ

سلێمانی بانگەوازێكی بەرزو دەنگێكی دلێری گەیاندە ئاسمان ، بە هۆی «نالی» كە لە موفەكیرو شاعیرەوە ، بانگەوازی زمانە یەكگرتووی ئەدەبی بۆ سەرجەم میللەتی كورد ڕاگەیاند ، كەتا لە سەرڕێو شوێنی ئەو زمانە یەكگرتووە نەڕۆینو بیرمان یەك نەخەین هەرگیز نانمان بەدۆ ناگاو یەكمان بە دوو نابێ لە سلێمانیدا سەرەتاو بەردی بناغەی پیشە سازی خۆماڵی لە موتابچێتیو دەبا نحچێتەو صابون دورست كردن دامەزرا ، وە ئێستا لەگەڵ پێشكەوتنو هەڵسوڕانی چەرخو هاتنە پێشوەی ڕۆژگاردا ئێمە بەرەو لوتكە بڕۆین ، كەچی بە خۆمان ڕەوا نەبینیو پارێزگاریمان بۆ نەكرانو ئیستاش زۆر بە زەحمەت بەو پیشە خۆماڵییە چاكانە دەگەینەوە ، لە هەمان كاتیشدا هەرگیز دروست نییە بێ ئومێد بین ، لەبەر ئەوەی زەبوونە لە پیاوان ناوەشێتەوە .

لە سلێمانیداو بۆ ماوەی نیو چەرخ یا پتر هەموو بارو دۆخێكی ژیان ڕوویان لە بەرزی بوو ، تەنها لە چوارچێوە یەكی رووێ جوغرافیادا .نەمایەوە ، بەرەو یەكێتی نەتەوەیە دەچووە پێشەوە تا وای لێهات چاوی ئاوات لەوێدا ئارامی دەگرتو ماندێتی ڕێگا لەوێ دەردەكراو دیسانەوە چوونە پێشەوە دەستە پێ دەكردەوە ، تا بە ئەندازەیەك سلێمانی بووە «دڵ»و مەڵبەندی شانازی مێژوویە بۆ هەموو كوردان .

لەم وشەیەدا ئێمە هەرگیز ناتوانینو نامانەوێ لە نرخو بەهای ئەو شارە بدوێین ، چونكە ئەوە ئاسان نییەو زۆری دەوێ ، بەڵكو ئەوەی مەبەستە سەرەكی بێ ئەوەیە كە هێندەی نەماوە شارەكە پێ بنێتە یادی دوو صەد ساڵەیەوە ، واتا لە ساڵی «١٩٨٤»دا دوو چەرخ بەسەر دروست كردنی سلێمانیدا تێ دەپەڕێ .

ئەو یادە لە مێژووی گەلی كوردو لە جوغرافیای كوردستانی خواروودا دیارەو ڕووداوێكی بایەخدارە ، بائێمەش نرخی گەورەیە ئەو بیرەوەریە بزانینو لە جێی خۆیدا بەسەنگین هەستی پێبكەین ، یا بە هەرەمەییو بێ دەنگی بە سەرماندا تێنەپەڕێ ، لە ئێستاوە چەند لێژنەیەكی شارەزاو پسپۆڕ لە ئەندازیان ، ، مێژوو نووسان ، جوغرافیا زانان ، ئەدیبانو پیاوانی دنیا دیدە پێك بێن بۆ ئەوەی هەر لیژنەو لای خۆیەوە لێكۆڵینەوەو دەیان ڕاپۆرتی زانستانە ئامدە بكەنو بە هەمووان بۆ پێشكەوتنیو ڕازانەوەی ئەو شارە تێبكۆشن .

هەر میللەتێك لە میللەتانە سەر ئەم زەویە بگرین لە بیرەوەری ئاوا گەورەدا دەیان ئاهەنگو كۆبوونەوەی گەورە گەورە ساز دەكەن ، چونكە دەزانن ئەو بۆنەو یادگارانە سەرپێیو لە خۆڕا دروست نەبوون ، بەڵكو بیری بۆ گوشراوەو خوێنە بۆ رژاوە ، بەسەدان هەزار گەنجو بە خۆڕایەوەو جواناویان بۆ ڕشتووە .

لە كۆتاییدا داوا لە یەكێتیی نووسەرانی كورد ، شارەوانی ، زانستگای سلێمانی ، هەموو خێرخوازەكانو پیاوە دەستدارەكانو دەزگا پەیوەندارەكان دەكەین لە ئیستاوە بۆ ئەو كاتە بیر بكەنەوە ، تەگبیر بكەنو نەخشەیەكی ژیرانەو زانستانە بكێشن لە گەلێك ڕۆژانە ساڵی «١٩٨٤»دا ئەو یادە زیندوو بكەنەوەو بایەخی شیاوی بدەنێ .

# لە پێناوی سازکردنی مەهرەجانێکی بەهاداردا

بەبۆنەی جەژنەکانی ئادارو نەورۆزی پیرۆزە ، وە لە پێناوی گەشەکردنی رۆشنبیری و هونەرێکی رەسەنو هاوچەرخی کوردیدا دەزگای رۆشنبیری و بلاوکرنەوەی کوردی بەنیازی سازکردنی مەهرەجانێکی گەورەو فراوان لە کوردستاندا بانگەوازێکی بلاوکردەوە داوای لەهەموو دەزگاو دامەزراوە رەسمیو نیمچە رەسمیو یەکیەتیو ئیپو نەقابەکان کردوە کە پەیوەندیان بەرۆشنبیری و هونەری کوردییەوە هەیە بۆ ئەوەی لە مەهرەجانەکەدا بەشداربن تاکو بەهاوکاریو کۆمەکی هەموو لایەك مەهرەجانێکی ئاڵو والای بەهادار لە ئەمساڵدا سازبکرێت . بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارو خزمەتە پیرۆزە دەزگای رۆشنبیرو بلاوکردنەوەی کوردی چاکی تەقەلاو تێکوشانی لێ بەلادا کردوە . بەهەموو توانایەوە خەریکی نزیك بوونەوەو پەیوەندی کردنە بەهەموو لایەنەکانەوە ، وەکو کورەی هەنگ خەریکی جمو جۆڵو پەیوندی بەناوچەکانی کوردستاندا . ئەوە بوو بەم بۆنەوەیەوە مامۆستا اسماعیل رسول بەرێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لەگەل چەند کار

گوزارێکی تری دەزگاکەدا چوونە ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەپارێزگای سولەیمانیو هەولێردا چەند دیدەنو دانیشتنێکیان لەگەل لایەنە روشنبیریو هونەرمەندە کوردەکاندا کرد

( لەگەل یەکیەتی نووسەرانی کورد لە سلەیمانیدا )

مامۆستا اسماعیل رسول بەرێوەبەری گشتی دەزگای روشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی لە سەردانەکەی سولەیمانیدا لەرۆژانی شەممەو یەکشەممە کەرێکەوتی ٢٦ ، ٢٧/ کانوونی دووەمی / ٩٨٠ دا دوو کۆبوونەوەی لەگەل لێپرسراوی ئەندامانی دەستەی بەرێوەبەری یەکیەتی نووسەرانی سلەیمانی کرد پاش سوپاس کردنێکی گەرم لەلایەن مامۆستا اسماعیلەوە کە بەدەنگ بانگەوازەکەی دەزگای رۆشنبیرییەوە هاتوون وەئەرکی ئەم کۆبونەوەیان کێشاوە ئەمجا کەوتە سەر باسی مەبەستی گرانو سازکردنی ئەم مەهرەجانە رۆشنبیری هونەرییە .

نیشانیدا کە سازکردنو سەرکەوتن لەم فیستڤالە دەبێتە هۆی تەقینەوەی وزە شاراوە کپ کراوەکانی کۆمەلگای کوردەواری کەرێ خۆش ئەکا بۆ گەشەکردنو پێشخستنی بزووتنەوەی روشنبیریو هونەری رەسەنی کوردی لەسەرانسەری هەرێمی کوردستاندا ، جگە لەدەرخستنو ئاشنا کردنو پێناساندنی نووسەرو هونەرمەندو بەهرە دارانی کورد بە جەماوەری کوردەوارییەوە چونکە گیرانی ئەم فیستڤالە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە رۆلە لێهاتوەکانی کورد لەم مەیدانەدا توانای بەهرەی خۆیان بخەنەروو ئەمە جگە لەوەی کە لەم بەهارەدا دانیشتوانی

**پەیوەندی بۆ دروست کردنی میهرەجانی بالای رۆشنبیری وهونەری**

بەرێوەبەرایەتی گشتی دەزگای رۆشنبیری بلاوکردنەوەی کوردی نووسراوی رەسمی ئاراستەی ئەمانەتی گشتی رۆشنبیریولاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیو زانکوی سلیمانیو بەشی کوری کۆڕی زانیاریو یەکیتی نووسەرانی کوردو کۆمەلەی رۆشنبیری کوردیو دەزگای ئیستکەو تەلەفزیونودامەزراوی گەشتو گوزارو کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردیو تیپە هونەریەکان کردووە ، بۆ ئەوەی نوێنەری خۆیان بۆ ئەو لیژنە بالایە دیاری بکەن کە بۆ سەرپەرشتیکردنو خۆئامادەکردن بۆ ئەو میهرەجانە گەورەیە دەکرێ کەدەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی سازیدەکاو بریارە لە شاری ( هەولێر ) ی مەلبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستاندا لە جەژنەکانی ئادارو نەورۆزدابێ .

هەرێمەکە حەفتەیەك بەخۆشیو ئاهەنگ گێران ماوەیەك ئەبەنە سەر ، بۆیە مامۆستای بەڕێوەبەری دەزگا لە پێشەکی ووتەکانی‌دا تکای لەهەموان کرد کە باش گرنگی بەفیستڤالەکە بدەنو بەگیانێکی بەرزەوە لەخزمەتی گشتی لە سەرووی هەموانەوە بێت و بخەینە پێش چاو وەپێشنیارو تێبی‌نیەکانی خۆیان بۆ سەرخستنی مەهرەجانەکە نیشان بدەن وەرای گەیاند کەدەزگای روشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی هەمور ئەو بەرهەمور بەهرەیەی لەم فیستڤالە کە لەلایەن لایەنە بەشداربووەکانەوە پیشان دەدرێ بلاوبکرێتەوە لەروزنامەو گۆڤارەکانی دەزگای روشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌دا . ئنجا نووسەرانی کورد کەوتنە قسەو گفتوگو وەلەم‌بارەیەوە زۆر بەسەربەستی بیروڕای خۆیان بەرامبەر مەهرەجانەکە وەچۆنیەتی سازکردنی وەسەرپەرشتی کردنی دەربری . مامۆستا اسماعیل لەم گفتۆگەیە دووپالی کردەوە هەمیشە پەیوەندی بەهەموو رۆشنبیرانو ئەدیبانەوە ئەبەستێت جا لەرێی یەکیەتی نووسەرانەوە بێت یان راستەو خۆ .

هەرلەم کۆبوونەوە مامۆستا صالح کەریم ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد لە سولەیمانی رای‌گەیاند کە بەلای ئەوەوە واباشە کە پتر بایەخ بەلایەنە روشنبیری‌یەکە بدرێت بۆ ئەوەی کارەکە پچر پچر نەبێت وەنابی دەزگای رۆشنبیری بەکارێکی وابەربلاو هەلسێت کەکارو چالاکی‌یەکان کالو کەچ دەربچن ، ئەمەو گەلێ پێشنیاری تر کە وەکو ئەوەی لژنەی سەرپەرشتی‌و سازکردنی فیستڤالەکە پتر بکرێت‌و بۆ ئەوەی هەموو لایەنە روشنبیری‌و هونەری‌یەکان تێ‌ی‌دا بەشدار ببن وە داواشیان کرد کە فیستڤالەکە لەژێر دروشمی :

**( لەپێناوی رۆشنبیری‌و هونەرێکی هاوچەرخی کوردا )** بگیرێت ، وەماوەی مەهرەجانەکە دوا بخرێت تاکو ٢٠/٤/١٩٨٠ ی داهاتوو ئەمجا بەپەسندیان زانی کە رۆژنامەو گۆڤارە کۆنەکانی کوردی بۆ مەهرەجانەکە بەئۆفسێت چاپ بکەنەوەو دابەشی کەن بەسەر خەلکەکەدا هەروەها پێشنیاریان کرد کە هەموو پیاوە رۆشنبیرو هونەرمەندەکان بانگهێشتن بکرێن‌و رێزیان لێ بگیرێت وەهەروەها داوایان کرد کە پۆستەرێکی تایبەتی بۆ فیستڤالەکە دروست بکرێت کەتەعبیر لەبەرگی هەموو پەرتووك‌و گۆڤارو رۆژنامە کوردی‌یەکان بکات کەپێشتر دەرچوون ئەمە جگە لەوەی بەپەسندیان زانی کە داوا لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بکرێت بۆ ئەوەی هەموو ئەو چالاکیانەی ئەنوێنلرێن تۆماری بکەنوو بلاوی بکەنەوە ئەمەو گەلێ پێشنیاری تر خرایە روو .

---

### هەندێ پێشنیار لە بارەی مەهرەجانەوە

کورتەی ئەو پێشنیارانەی لایەنە رۆشنبیری‌و هونەریەکانی لە پارێزگاکانی ناوچەی ئوتونومی لە هەرێمی کوردستان پێشکەشیان کردووە ، دەربارەی سازکردنی ئەو مەهرەجانە رۆشنبیری‌و هونەریەی دەزگای روشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی ئەیگیرێت بە بۆنەی جێژنەکانی ئادارو نەوروز .

● لەرێ‌ی یەکیتی نووسەرانی کوردەوە « مەلبەند » داوا لە لایەنە رۆشنبیری‌یەکان بکرێت باسەکانیان بۆ مەهرەجانەکە بینرن .

● تاکو سەری مانگ درێژە بە وەرگرتنی کەرستەکانی مەهرەجانەکە بدرێ .

● رێز لە روشنبیرو هونەرمەندەکانی کورد بگیریت‌و بەرهەمەکانیان لە چاپ‌بدرێن .

● رۆژنامەو گۆڤارە کۆنە کوردیەکان لەهەریەکە چەند دانەیەکی بە ئوفسیت لێ لە چاپ بدرێت .

● مەهرەجانەکە لە ژیر دروشمی ( لەپێناوێ رۆشنبیری‌و هونەری رەسەن‌و هاوچەرخی کورد ) ی‌دا بێت .

● نوینەری هەموو تیپە هونەریەکان بخرێنە لیژنەی ئامادەکردنەوە .

● لیژنە هونەریە پێك هاتووەکان بکرێن بە لیژنە تایبەتیە هونەریەکان .

● ٢٠ی نیسان دابنرێت بە رۆژی دەست‌پێکردنی مەهرەجانەکە .

● خەلاتی پارە بەلایەنە هونەریە بەشداربووەکان بدرێت ، وەپێشەکی دەستیان بگیرێت تاکو لە کاروباری‌یان خەرجی بکەن .

● کۆڕی تایبەتی ، بۆ یەکیتی نووسەرانی کورد تەرخان بکرێت .

مامۆستا اسماعیل رسول پاش هەڵسەنگاندن و لێدوان لە پێشنیارەکانیان بەڵێنیدانێ کەپێشنیارەکان لەلایەن لژنەی بەرزی سازکردنی مەهرەجانەکە لێی ئەکۆڵدرێتەوەو بریاری لەسەر ئەدرێ

**( لەگەل نوێنەرانی تیپە هونەرییەکاندا )**

سەر لەبەیانی رۆژی یەکشەممەی ریکەوتی ٢٧ی کانوونی دووەم مامۆستا اسماعیل رسول لەگەل هونەرمەندەکانی سولەیمانی کۆبوونەوەیەکی ریکخست ، پاش بەخێرهاتن و سوپاس کردنیان هۆی گیران و سازکردنی ئەو فیستفالەی دەزگای رۆشنبیری بەدەستەیەوەتی بیکات خستە روو ، وە تکای لە هەموان کرد کە زۆر بەسەر بەستی بیرو راو پێشنیاری خۆیان بخەنە روو .

کاك ئەنوەر قەرەداغی وای بە پەسندزانی کە لایەنە هونەرییەکە لەبەشی رۆشنبیریەکە جیا بکرێتەوە وە بۆ هەر یەکێکیان فیستفالیکی تایبەتی بگیرێت تاکو . باشتر هەر یەکەیان بە تایبەتی بخرێتە پێش چاو .

بەشە هونەرییەکە بە دووەم فیستفالی هونەری ئەژمێرێت سەربارەت بەوەی فیستفالی هونەری یەکەم سالی ١٩٧٤ لە لایەن بەریوە بەری گشتی رۆشنبیری کوردی یەوە لە بەغدا گیرابوو وە وای بەبلش زانی کە نوێنەری تیپە هونەرییەکانی سولەیمانی بەشداری کۆبوونەوەکانی لژنەی بەرزی سازکردنی فیستفالەکە بکرێت. . هەروەها پەسندیان کرد مەهرەجانەکە لە ٢٠ی نیسانی داهاتوو دا بگیرێت ئەمەو گەلی پێشنیاری تر لەلایەن هونەرمەندانی سولەیمانی‌یەوە خرایە پێش چاو وە لە کۆتایی کوبوونەوەکەدا بەرێوەبەری گشتی دەزگای رۆشنبیری مامۆستا اسماعیل رەسول بەڵێنی دا کە هەموو پێشنیارەکانیان لە لژنەی بەرزی ساز کردنی فیستفال بخرێتە روو وە داواش لە کاك محمد مکی عبدالله سەرۆکی تیپی هونەری گەلی کرد کە بەلکو راپۆرتێکی تایبەتی ئامادە بکات و وە تیایا روونی بکاتەوە کە چەند وە چۆن تیپەکەی ئەتوانێ بەشداری لە چالاکی‌یەکانی فیستفالدا بکات

**( چاو پێکەوتنێك لەگەل ئەندامانی دەزگای بەرێوەبەری کورد بەشی هەولێر )**

لە پاش نیوەرۆی رۆژی دووشەممەی رێکەوتی ٢٨ی کانوونی دووەم . مامۆستا اسماعیل بەرێوەبەری گشتی دەزگای روشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی ، لە هەولێر دانیشتنێکی لەگەل ئەندامانی یەکیەتی نووسەرانی کورد بەشی هەولێر کرد . پاش بەخێر هاتنیان تکای لێکردن کە پێشنیارەکانیان بۆ سازکردن و سەرخستنی فیستفالەکە بخەنە روو .

مامۆستا عزالدین فیضی ئەندامی یەکیەتی

---

● شانۆی ( الثورە الجوال ) بهێزیت بۆ هەولێر .

● هەندێ چالاکی مەهرەجانەکە لە دەرەوەو لە هەوای پاکا پێشان بدرێ .

● رۆشنبیرەکان پێشنیازیان کرد کە بەشی هونەری لە مەهرەجانەکە جیابکرێتەوە .

● لیژنەیەکی تایبەتی دابنرێت بۆ هەڵبژاردنی ئەو (مادە) رۆشنبیری‌یانەی کە بۆ مەهرەجانەکە دەستدەدات .

● کۆری تایبەتی لە مەهرەجانەکە تەرخان بکرێ بۆ زمانی کوردی .

● کۆری تایبەتی لە مەهرەجانەکە تەرخان بکرێ تایبەتی بۆ فولکلوری کوردی .

● کۆری تایبەتی لە مەهرەجانەکە تەرخان بکرێ تایبەتی بۆ مێژوی کوردی .

● نووسەرو هونەرمەندو لێکۆڵەرەوەکانی کوردو عەرەب لە ناوەو دەرەوەی وڵات بۆ مەهرەجانەکە بانگ بکرین .

● لە پیشانگای پەرتوکدا بەشێك بۆ رۆژنامەی کوردی ریکخرێت .

● لیژنە هەڵسەنگینەرەکان بەسەر پارێزگاکان دابەش بکرین .

● وێنەی پۆستەرەکانی مەهرەجان وابکێشرێن کە بەرگی پەرتوکو گۆڤارە کوردیە دەچوەکانبن .

● تیپی هونەری رەواندوز بۆ بەشداربوون لە مەهرەجانەکە بانگ بکرێ .

● هەگبەی ( جانتای ) نایلونی تایبەتی بۆ مەهرەجان دروست بکریت

● بلاوکەرەوەیەکی تایبەتی رۆژانە بۆ کاروباری مەهرەجانەکە دەربهێزێت .

● لە تەلەفزیونی کەرکوك داوابکریت کە بە درێژایی رۆژانی چالاکی مەهرەجانەکە ، ئوتومبلیکی گوێزەرەوەی وینەو دەنگ تەرخان بکات .

نووسەرانی کورد لە هەولێر پێشنیاری کرد کە لە ڤیستڤالەکە دا کۆڕێکی تایبەتی بۆ مێژووی کورد بگیرێ وە داوا لە چەند شارەزاو پسپۆڕێك بکرێت بۆ ئەوەی چەند باسێك لەم ڕووەوە ئامادە بکەن هەروەها ووتی پێویستە چیرۆکی کاوەی ئاسنگەر بەتایبەتی ئەوەی کاك شێرکۆ بێکەس نووسیەتی لەسەر شانۆ نیشان بدرێت وە خەلاتیش بۆ چاکترین چیرۆك نووس و شیعر دانەروو باشترین بەرهەم تەرخان بکرێت . دوا بەدوای ئەوە مامۆستا عزالدین فیضی بە لیستە ناوی چەند شاعیرو وێژەوانوو هونەرمەند پیشاندا وە داوای کرد بخرێنە لژنەکانی هەلسەنگاندنی بەرهەمەکان، ئەمەو چەند پێشنیارێکی تر پێشکەش کرا وە زۆر بە دڵخۆشی و سنگ فراوانیەوە لە لایەن مامۆستا اسماعیل رسول گفتوگۆی لێ کراو وە بەڵینی پێدان کە لە لایەن لژنەی بەرزی سازکردنی ڤیستڤالدا ئەخرێنە پێش چاو

**( دانیشتنێك لەگەل تیپە هونەری یەکانی هەولێر دا )**

لە هۆلی ئوتێلی هەورامانی هەولێر دا نیوەڕۆی ڕۆژی سێ شەممەی ڕیککەوتی ٢٩ ی کانوونی دووەم : مامۆستا اسماعیل چاوی بەنوێنەری تیپە هونەری یەکانی هەولێر کەوت دوای پێش وازی یەکی گەرم تکای لێکردن ئەوەی بەباش ئەزانن بۆ سەرخستنی ئەم ڤیستڤالە باسی لێ بکەن .

ئەمجا کاك جەمال هدایەت یەك لە لێپرسراوەکانی هونەرمەندانی هەولێر ئەو بریارانەی پێشان دا کە لە کۆبونەوەدا دەزگای بەریوەبەری تیپەکەیان دابوویان بۆ بەشداربوونیان لە ڤیستڤالەکەدا . لە دوای ئەو گەلێ لە نوێنەری تیپەکانی هەولێر دوان . ئەمجا کاك سەعدون بەناوی تیپەکانەوە پێشنیاری خۆی راگەیاند وە داوا کرا کە تیپی هونەری رەواندزیش بانگ بکرێت بۆ ئەوەی لە ڤیستڤالەکە بەشدار بن

هەروەها داواش کرا کە هونەرمەندانی دهۆك بەتایبەتی تیپی قوتابخانەکان بانگ بکرێن .

ئەمە ئەو چاو پیکەوتنانە بوون کە مامۆستا اسماعیل رەسول بەریوەبەری گشتی دەزگای روشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی لە گەشتەکەی دا بە ناو ناوچەکانی ئوتونومی کردبووی لەگەل کورتەی ئەو گفتو گۆو لێدوان و پێشنیارانەی لە کۆبوونەوەکانی لەگەل ڕۆشنبیرو هونەرمەندانی کورد بۆ سازکردن و سەر خستنی ڤیستڤالەکە کردبووی.

---

**بانگهێشتنێك**

## لە دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی یەوە !

دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بەبۆنەی جەژنەکانی ئادارو نەورۆزەوە لە شاری هەولێری مەلبەندی ئۆتۆنۆمی میهرەجانێکی ڕۆشنبیری و هونەری سازدەکات و لەمیهرەجانەکەدا چالاکی وجموجۆلی هەمەچەشنەی ڕۆشنبیری و هونەری پێشکەش دەکرێ وەك چەند کۆڕێك بۆ هەلبەست و چیرۆك ودیراسات و لێکۆلینەوەی جۆربەجۆر ، سەرەڕای پێشانگای کتێب و چاپەمەنی کوردی و هونەری تەشکیلی و چالاکی شانۆگەری و گۆرانی و مۆسیقا . زوربەی دامەزراوە ڕۆشنبیری یە رەسمی و نیمچە رەسمی یەکان کە پەیوەندی یان بە ڕۆشنبیری کوردی یەوە هەیە لەم میهرەجانەدا بەشداری دەکەن و لیژنەیەکی بەرز بۆ ئەم میهرەجانە دامەزراوە کەنوێنەرانی ئەم دامەزراوانە بەشدارن تێیدا : وەك ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان و دەستە کوردی یەکەی کۆڕی زانیاری عیراقی و زانکۆی سلیمانی و ئیستگەی کوردی و دامەزراوی گشتی گەشت و گوزار ویەکێتی نووسەرانی کورد و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی و کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی ، ئیتر داوا لە هەموو ئەدیب و هونەرمەندان دەکەین کە بەوپەڕی لەخۆ بوردنەوە لەم میهرەجانەدا بەشداری بکەن وبەرهەمی هەلبەست و چیرۆك و لێکۆلینەوەیان پێشکەش بەدەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بکەن لەماوەیەکدا کە ئەوپەڕەکەی ناوەڕاستی مانگی شوباتی ئایندەیە ، بەو مەرجەی کە ئەوەی ئارەزوی بە شدار بوون دەکات پێشەکی ئاگادارمان بکات و ئەو کەرەسەیەش دەستنیشان بکات کە لە میهرەجانەکەدا بەشداری پێوەئەکات .

**بەریوەبەری گشتی**
**دەزگای ڕۆشنبیری و**
**بلاوکردنەوەی کوردی**

# بەرەو پێشکەوتن

## ئامێرێکی نوێ

دۆزینەوەی ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی گوێچکەی منال ئەبێ

بەهۆی ئامێرێکی نوێیەوە تێکرا ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی گوێچکەی منالآن ئەبێ زۆر ئاسان بووە ... ئەویش بەنزیك کردنەوەی ئامێرەکە لەنلو گوێی منالەکەدا پاش ئەوەی بە چرایەکی تایبەتی رووناك ئەکرێتەوە .

بەم رەنگە بەشێوەی سەرەتایی ئەو نەخۆشیانە دیاری ئەکرێ .

## هەفتەی رێزگرتنی جواد سلیم



مۆزەخانەی نیشتمانی بۆ ڕیزگرتنی یادی هونەرمەندی کۆچ کردوو ( جواد سلیم ) کە یەکێکە لە ناودارترین دامەزرێنەری جولآنەوەی هونەری نوێ لە عیراقدا هەفتەیەکی تایبەتی ڕێکخست لە ٢٤ــ٣٠ کانوونی دووەم .

لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا کە لە هۆلی مۆزەخانە گیرا پیشانگایەك ڕێکخرا بۆ تابلۆ گرنگەکانی جواد سلیم وگەلی وینەو نیگاری تایبەتی ژیانی وچەلاکیەکانی پیشان درا .

ئەتوانین بلێین ئەم پیشانگایە یەکەم ڕێزگرتنە تا نیستا کە بۆ ئەم هونەرمەندە ئاوا ریکخرابێ .

بەتایبەتی ئەو ووتارەی کە جبرا ابراهیم جبرا پیشکەشی کرد بە ناوی ( مەودای کەلەپوری نەتەوایەتی لە هونەری جواد سلیم ) دا کە روشناییەکی نۆیی بە بەرهەمەکانی بەخشی

هەروەها ( دوکتور احسان فتحی ) ووتارێکی پێشکەش کرد بەناوی (بالەخانەکانی بەغدا لە هونەری جواد سلیم ) دا بەو بۆنەیەوە لە کۆتایی هەفتەکەدا ئیوارەیەکی شیعری ریکخراو کلرە چاکەکانی ئەو هونەرمەندە ئاوایە تیدا رەنگی دایەوە .

## ئاخۆ کەی تەبەقی فڕین

## دەبێ بە راست ؟

وا دەبێ بە چارەکە سەدەیەك خەلکی ئەم سەرزەمینە چیرۆکی سەیر ئەبیستن و ئەخوێننەوە لەسەر تەبەقی فڕین .. لە ناوەخنی ئەو باسانەدا گوایا دانیشتووی ئەستێرەکانی تر هەروەکو ڕۆژنامە گیرەکانی نیشانی ئەدەن .. هەوینی ئەم کارەن .. بەلآم زانستی تازە ئەم بەنگو بلوانەی تێکرا بە درۆخستۆتەوە .. وە نیشانی داوە کە ئەم تەبەق فڕینە .. یا دیاردەیەکی تیشکی ڕۆژە یا هەر شتێکی نەبووە .

ئەوەی شیاوی باسە یەکێك لە کۆمپانیا ئینگلیزییەکان .. لەم ماوەیەدا پلانێکی داناوە .. کە بالۆنێك دروست بکا لە وێنەی تەبەقی فڕین بۆیە لە دوواڕۆژێکی نزیکا ئادەمیزاد بە چاوی خۆی تەبەقی فڕینی ڕاستی لە ناوجەرگەی ئاسماندا ئەبینێ و خەلکی لە مەودایەکی دوورەوە بۆ مەودایەکی تر ئەگوێزێتەوە .. وەکو ئاشکرا بووە ئەتوانێ (١٠٠) ئەفەر یا (١٠) تەن کەلوپەل هەلگرێ بە ئاسماندا .

## گەڕانەوە بۆ کەشتیی چارۆکەدار
## « السفن الشراعیه »

تا ساڵی ١٩٠٦ نزیکەی دە هەزار کەشتی چارۆکەدار لەدەریا وئۆقیانوسەکاندا ئەهاتن‌و ئەچوون کە سەد تەن یازیاتر قورسایی هەریەکیکیان بوو ، بەڵام ئەمڕۆ ژمارەیان زۆر کەم بۆ تەوەو زۆربەیان بۆ مەشق بەکار ئەهێنرێن .

بەڵام گیروگرفتی ووزە کارێکی وای کردووە کە ئەمڕۆ لە زۆر وولاتاندا خۆیان ئامادە ئەکەن‌و پلان دائەنێن بۆ دروستکردنی کەشتی چارۆکەدار هەرچەندە زۆر لەم هەوڵ‌و کۆششە تا ئێستا هەر بریتی‌یە لە تاقی کردنەوە ، بەڵام ژاپۆن توانی یەکەمین کەشتی چارۆکەدار بە ناوی (مینی جاغۆ) بە قورسایی ٨٠ تەن وبەسێ چارۆکەدار وەمەکینەیەکی یاریدەر بە خێرایی ١٥ گرێ دابەزێنێتە ناو دەریا . لەم دوایی‌یەشدا کۆنگرەی دەوڵەتی زۆر گیراوە بۆ ئەوەی ئەو کەشتی‌یانە بەووزە ئیش‌ئەکەن بیگۆڕن بە کەشتی چارۆکەدار . بەم چەشنە ڕژێمی سەرمایەداری کە زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ بەسەر دامەزراندیا تێ ئەپەڕێ کەچی لەتوانایا نیە گیروگرفتی ووزە چارەسەر بکات‌و گەل گیرەوکێشەی سووتەمەنی ڕزگار بکات .

## لە چاپ کراوی نوێی کوردی

١ ــ ژمارە (١٦)ی گۆڤاری پەروەردەو زانست پایزی ١٩٧٩ کەوتە بازارەوە .

ئەم گۆڤارە بریتیە لە گۆڤاریکی تایبەتی کە بەڕێوەبەریتی گشتی‌ی خوێندنی کوردی بەسێ مانگ جارێ دەری دەکات ، کە خوی لە خۆیا ناوە سوودبەخشەکەی لێنراوە کە ناوەڕۆکی گوڤارەکە لێی ئەدوی ، واتە چەندین ووتارو باس‌ی تایبەتی پەروەردەیی‌و زانستی‌و لیکۆلینەوەی تیدایە .

ئێمە کە بەچاوێکی ڕێزەوە هەلینەسەنگینین‌و دلمان پێ‌ی خوشە لە هەمان‌کاتدا چاوەڕوانی زیاتر لەم گوڤارە ئەکەین و هیوادارین بەگەشەکردنی‌و بەرەوپێشەوە چوونی بە ووتارو ناوەڕۆکی کامل هەروەها شیوەو روخساری ورەنگ‌و بوی وەکو رەنگی ریکەوتوو لەیەك وەشاوەی بەرگەکەی کە نیشانەی پەروەردە بدا کە ئەمیش لەچوارچێوەی منال‌و پەیوەندی بە منالەوە بێت یاخود زانستی‌و بابەتی نوێ تەکنولوجیا .

٢ ــ ئەمینداری گشتی روشنبیری‌و لاوان وادیارە بەش‌داری ئەدەبی منالآنی کردوە نەك هەرهی لاوان .

تیتلەو بیبلە لە نووسینی عمر ابراهیم عزیز خستە بازاری منالآنەوە هەریەکە بەلایەکدا فڕان فڕانیانە بۆ ئەو چیرۆکە وردیلانەی کە زوربەی لە کەلەپوری نەتەوەیی وەرگیراوە ، سا یا بەدەقەکەی خۆیەوە ماوەتەوە یاجود کەمێ دەست کاری کردوە.

ئەمەش هەر دیسان جێ‌ی سەرنجەو چەن پێشنیاریکی دلسۆزانەی ئەوی کە تەنیا بۆ خزمەتی ئەدەبی منالآن‌و پشتگیری لە خاوەنەکەی بێ کە بتوانی لەمەو دووا زیاتر هەولی بەرهەمی جوانتر بداو کۆبکاتەوە لە کەلەپور چونکە وەکو بزانم کە ئەمە یەکەم بەرهەمی کاك عمر ابراهیم عزیزە ، بەلآم لە کاتی چاپکردندا ئەبێ بایەخ بە ناوەروك بدات بە تایبەتی وینەو نیگارەکان رەنگاو رەنگ بن‌و باشترە پیتەکان درشت بنوسرێن .

# گەشەکردنی ئابوری و لێدوانێك دەربارەی زاراوەی دواکەوتن

دکتۆر محمد فاضل محمد عزیز قەفتان

کۆمەڵگای مرۆڤ ، بەردەوام لە جوولاندن و گۆڕینێکی هەمیشەیی بێ ووچان دایە ، هەندێکیان بەرەوپێش دەڕۆن و هەندێکشیان لەو کاروانی پێشکەوتنە کەم تا زۆر دوا دەکەون ..

مێژوو ، سەلماندویەتی کە سەرکردایەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و شارستانێتی، لە نێو چەرخو ڕەوڕەوەی مێژوودا لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی کە دەگوێزرێتەوە. وە ئەوەی شایانی باس بێ ، هەڵهاتنی ئەم شارستانیانە ، هەر لە سەرەتاوە ، لە وولاتانی « ئاشوور و بابل و میسر » ە وە ، دەستی پێ کردوە و پاشان لە « ئەثینا و رۆما » وە گەشەی کردوە ، و ئینجا گەیشتۆتە وولاتانی سەرووی ئەفریقا و ئەندلس ، وە وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ، هەمیشە بارێکی ئابووری باش و بەختەوەری هەبووە، بە پێچەوانەی وولاتانی ئەوروپای ئەو کاتە ـ بەلام ئەمریکا ، هێشتا ناوشی نەبوو بەڵکو نەدۆزرابووە وە، پاش ئەمە شارستانێتی و گەشە کردنی ئابووری و کۆمەلایەتی ڕووی کردە وولاتەکانی ئەوروپا ، ئەویش لە ئاکامی ئەو ووریا بوونەوە زانیاری‌یانەی نێوکۆمەلانی ئەم وولاتانە و ئەمەش درێژ بووەوە زیاتر باڵی کێشا بەرەو وولاتەکانی ئەمریکاو کەنەدا ، و پاشان ژاپۆنی گرتەوە و بەڵکە ئەمیش خۆی فڕێ دایە ، نێو ئەم کاروانەوە ، ئەوەش لە کۆتایی سالانی سەدەی نۆزدەیەم دا ، پاشان یەکێتی سۆڤیەت لە قۆناغی پێش شەڕی جیهانی دووەم دا ، بەشێوەی وولاتێکی پێش‌کەوتوو دەرکەوت و هاتە کۆڕەوە .. ئەوەی شایانی باسە .. گرنگی‌یەکی زۆر و بایەخدانێکی گەورە بە مەسەلەی گەشە کردنی ئابووری دراو بەتایبەتی ئەو وولاتانەی خلوەنی کەرەسە و ماددەی سروشتی خاوون ، ئەم گرنگی یە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی پاش شەڕی جیهانی دووەم • کە بەشێوەیەکی چالاك و گورج دەستیان دایە، ئەوش پاش ڕزگار بوونیان لە چەوساندنەو ژێر چنگی وولاتە ئیمپریالیزمەکان .

ئەم مەسەلەیە ، بووە شوێنی گرنگی‌ی بایەخ پێدانێکی بێ شماری پیاوە ڕۆشنبیر و ڕامیاری‌یەکانی ئەو سەردەمە و ، دەیان پیاوانی نیشتمانی و زانایانی ئابووری و کۆمەڵ ناسانی تر ، تا ئەم مەسەلەیە وای لێ‌هات گەیشتە رادەی باس کردن و لێکۆلینەوەی لە سەر ئاستی « کۆمەلی نەتەوە یەککرتووەکان » کە تا ئێستا چەندەها کۆنگرەی بالاو بەری بۆ گیراوە و لەدوور بینێکی زانستی و زانیاری یەوە ڕەچاو کراوە .. بۆئەوەی زیاتر بچینە بنج و بناوانی ماهیەتی پەرەسەندن و گەشە کردنی ئابووری، وەك شێوازێك کە بەکار دێت بۆ ڕواندنەوە و نەهێشتنی ئەو ڕێکرو تەنگ‌و چەلەمە ئابووری و کۆمەلایەتیانەی تووشی وولاتە تازە پێ‌گەیشتووەکان یان با بلێین « وولاتانی گێتی سێ‌یەم » بوون ، پێوستە لەسەرمان کە پێشەکی لەبارەی ماهیەتی دواکەوتن و شی‌کردنەوەی بۆچوون و ڕاکانی نووسەر پسپورەکان ، دەربارەیان شتێك بدوێن .. چونکە نووسەرەکان بەگشتی‌و ئابووری ناسەکان یەتایبەتی ، جۆرەها ڕاو شی‌کردنەوەی تایبەتی خۆیان هەیە دەربارەی دیاردەی دوواکەوتن ، وەیان بە مانایەکی کە بلێن ئەو تەنگ‌و چەلەمەو ناهەمواری‌یانەی تووشی ئەم وولاتانە بوون هەریەك لەوان دیاردەی دوواکەوتن دەگێرێتەوە بۆ هەندێ هۆ وە لەو هۆیانەش ، هەن کە دەلێن ، ئەم وولاتانە لە ئاکامی بارێکی تایبەتی ئاو و هەواوە دووچاری دوواکەوتن بوون .. و هەن لەوان هۆکەی دەگێرنەوە بۆ نەبوونی و هەژاری ئەو وولاتانەی خۆی لەبەروو بووم و کەرەسەی خاوی سروشتی .. وەیان هەن هۆکانی دەگێرنەوە بۆ مەسەلەی سروشت و دروست بوونی ئەو کۆمەلگاو میللەتانە، وەیان ڕوونتر لەمە ئەتوانین بلێن دەیگێرنەوە

بۆ هۆیەکی زۆر سەرکی و نزیك لە ڕاستی‌یەوە ڕیشەیان رهەن دیاردەی ئەم دوواکەوتنە دەگێرێتەوە بۆ هۆیەکی زۆر سەرکی و نزیك لە ڕاستی یەوە ئەویش کەهۆی داگیر کردن و چەپۆکی ئیمپریالیزمە.. ئەو نوسەرو پسپۆڕانەی کە لە بۆچونەکەیان شی‌کردنەوە یەکی جوگرافی‌یان گرتۆیە بەرو هۆی ئاوو هەواو چۆنیەتی شوێنی ئەو وولاتانە لەسەر ڕووی رەوی دەکەن بە هۆیەکی سەرەکی بەو دواکەوتنە ، هەمیشە وا دەری دەخەن ، کەو زووربەی ئەو وولاتە دوواکەوتوانە ، دەکەونە ناوچەیەکی ئیستوانی و مەداری‌یەوە ، کە پلەی بەرزی گەرما لەم ناوچانەدا کاری تەواویان هەیە بۆ تەمەڵ کردن و سستیان بەلام لە ڕاستی دا ؛ ئەم هۆیە سەرەکی و بنەڕەت نی‌یە ، چونکە پلەی گەرما هەرگیز بە

درێژایی سال نی‌یە ، بەلکو گەرمما تەنها لە چەند مانگیك دا کاریگەرە ، وە تەنانەت لە چەند سەعاتێکی ڕۆژدا ، و هەر لەم بارەیەوە ، دەتوانین بلێین کە گەرمما ، ئەو هۆ سەرەکی‌یە نی‌یە ببێتەئەو کەوتنە و بەلگەس بۆ ئەممە ئەوەیە کە مێژوو لەم ناوچانە دا وەك ناوچەکانی خواروی ڕۆژهەلاتی ئاسیا کە بە ناوچەیەکی زۆر گەرم دەژمێردێت ، چەندەها شارستانێتی و ئیمپراتۆریاتی سەرکەووتووی وای تیا دروست بووە ، کە ناتوانرێت ئیتر ئەم هۆیە بە هۆیەکی بنەڕەت و سەرەکی دابنرێت و زیاتریش لە مە ئەتوانین بلێین کە گەرمترین ناوچەی ئوستراليا ، بەردەوام لە چالاکی و جموجۆلی ئابووری دابووە و بەلکە بەردەوامە ، و دیسان گەرمی ئاوو هەوا هۆیەکی ڕێکر نەبووە لەبەردەم هەولی ئیمپریالیزمەکان ، لە دروست کردنی ؟ تازەکانیان بۆ مەبەستی بەرهەم هێنانو کشتوکال کردنی ( چاو ، قاوەو ، لاستیك ) وەیان هەلکەندنی بیرە نەوتی یەکان و چالە خەلوزەکان ، یا وەکو دەرهێنانی ماددەی مس و یورانیوم و زۆرەها ماددە و سامانی کانزایی تر لە ناوچە ئیستوایەکانو مەداری یەکان لە هەرسێ کیشوەرەکانی ئاسیلو ئەفریقا و ئەمەریکای لاتینی‌دا ، لە هەمان کاتدا دەتوانین بلێن کە مام ناوەندی ئاو و هەوا پەیوەندیەکی زیاتری بە بواری کشتوکال هەیە ، وەك لە بواری پیشەسازی ، لەبەر ئەوە دەتوانرێ شێوان و هونەری بەرهەم هێنان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بگوێزرێتەوە ، بەپێچەوانەی توانینی

گواستنەوەی زەوی و زار ، وەیا ئاوو هەوا . وە ئەوەی شایانی باسە زووربەی زۆری ئەم وولاتانەی باسیان دەکەین ئاوو هەوا کەیان مام ناوەندە ، نەك ئەو گەرمەی زۆر کاریگەرە .

جگە لەمەش گەشەکردنو پێش کەوتنی زانست و زانین لەگەل پێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا لە گشت جۆرەکانی بەرهەم هێنان و چاكبوونی‌و بلاوبوونی هۆ کارەکانی گواستنەوە ، ئەمانە هەموو ڕۆلی بایەخ‌دارو گرنگیان هەبووەو و هەیە بۆ سووك کردن و نەهێشتنی گیروگرفتی بەرزی و ڕادەی پلەی گەرما لەم وولاتانە دا ..

بەلام هۆی هەژاری ئەم وولاتانەو ، نەبوونی کەرەسەو ماددەی خاوی سروشتی ، وەك هۆیەك ، ببێتە دوواکەوتنیان لەڕووی‌ئابووری‌وکۆمەلایەتیانەوە، هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ وارا ئەوەی کە دوواکەوتن لە بنەڕەتەوە پەیوەندی هەیە بە بارو زروفی چالاکی ئابووری° لەکۆمەل دا .. و بێ‌گوممان بوونی ئەم سامان و کەرەسەو ماددە خاوە سروشتی‌یانە ، هەمیشە کاریگەر و بەکەلکن ، بۆ ئاستی ژیانیان ، بەلام لە هەمان کاتیشدا ، بوونیان بە تەنیا مسۆگەری ئەونەش‌و نوما گەشەکردنە ناکات ، و دیسان نەبوونیان وەیان نەبوونی هەندێکیان نابنە هۆیەکی زۆر گەورە و سەرەکی کە ئیتر نەتوانرێ چارەسەرێکی بۆ بکرێت ، و بۆ ئەم بۆ چوونەش ئەتوانین چاوێك بە میژووی ئابووری وولاتی ژاپۆن دا بخشینن کە تیایدا بۆمان دەردەخا ، کە ئەم وولاتە گەشە یەکی بێ شوماری کردبێ ئەوەی هیچ جۆرە سامانێکی نیشتمانی و ماددە و کەرەسەیەکی چاووی سروشتی هەبێت .. بەلام زووربەی ئەم وولاتانەی باسەکەمان لەسەرێتی لە زروفێکی دوواکەوتوو دان کە لە هەمان کاتدا خاوەنی زۆڕەها جۆری سامان و ماددەی خاوو کەرەسەی بە کەلکن .

بە شێوەیەکی گشتی ئەتوانین بلێین کە زوربەی ئەم وولاتانە ناتوانرێت بە وولاتێکی هەژار لە قەلەم بدرێت و بەتایبەتی لەڕووری سامانە سروشتی‌یەکانیدا، بەلام ئەتوانرێت بوتریت کە هەژاران لە بۆرای درك کردن وهۆشیاریان دەربارەی ئەو سامانو ماددەخلوانەی کە لەوولاتەکانیاندا هەیە ، بەلکو « کەم » و بەکزی ئاگادار « بوونی » ئەو سامانەی هەن ، یان درکیان پێ کردوەو ئاگاداری هەن بەلام

کەم و سست بەکاری دەهێنن ، لەکاتێکدا کەپێویستە ئەم توانا سامانەیان بەردەوام لەچالاکی ئابووری بۆ مەبەستی بەرژەوەندی نیشتمانی هەمیشە پڕ بەپڕو تەواو بەکاریان بهێنن ..

جگە لەم هۆیانەی تا ئێستا باسمان کردون ، کۆمەڵێکی‌کەش لە پسپۆرەکان هەن ، کە ئەم دوورکەوتنە دەگێرنەوە بۆ شی‌کردنەوەو ڕایەکی تەسك و بۆ چونێکی ڕەگەز پەرستی ، ئەم بۆ چوونەش وارای دەگەیێنێ کە دووا کەوتنی ئەم وولاتانە .. بۆ جۆری ڕەنگ ونەژادی ئەو میللەتانە دەگەڕێتەوە ، ودەلێت کەوا .. میللەتانی سپی ڕەنگ ، هەمیشە بەتواناو چاپوکترن لە میللەتانی تر ، جا ئەم میللەتانە ڕەش ڕەنگ بن یاکو زەرد ڕەنگ .. هتد . ودەڵێن .. کەوا لەم جۆرە میللەتانە ، توخم و بنەڕەتێکی دوواکەوتنیان تێدایەو هەمیشە تەمەڵ و سستو هیچ نەزانن و بەهیچ جۆرێك ، توانای فێربوون و تێ‌گەشیتنی زانست و تەکنەلۆژیاو هونەرەکانی بەرهەم هێنانیان تیادا نی‌یە .. بەڵام بێ گومان ئەوەی ڕوون و دیارە ، زانستەکان ومێژووی گشت میللەتان و شارستانیەکانی سەر ڕووی زەمین ، باشی دەریان خست ، وبەڵگە سەلماندیان کەتوخمی مرۆڤ یەك توخمن لەهەموو وولات وشوێنێکدا ، لەڕووی توانا و ئامادەیی‌یان بۆ گشت پێشکەوتن و گەشە کردنێك ، تێ‌گەشیتنی تەواویان بۆ هەموو جۆرە زانست و زانیاری‌یەك و کەڵك وەرگرتنی تەواویان لەگشت هونەرێکی تەکنەلۆژی، چونکە توانای مرۆڤ و زیرەکی رۆشنبیری مرۆڤ هیچ سنوورێکی بۆنی‌یە ، هەرگیز دان بەبوونی هیچ دیوارێك یا رێکرێك یاکۆسپ و جیاوازی‌یەك نابێ لەمرۆڤانی کۆمەلگایانی ئەم سەر ڕووری زەمینەدا ، بەڵکو مرۆڤ ڕەش بێ ، سپی ، یازەرد هەردەم رێ و شوێنی پێویستی بۆ خۆش و ئامادە بکرێ ، بەتوانایە هەموو زانست و زانیاریەك وەربگرێت و گەشەی پێ بکات بەگویرەی ئەو رێ خۆش‌کردن و رێ پێدانەی .

ئەم ڕاوو بۆ چوونانەی تا ئێستا خستومانەتە ڕوو ، بێ‌گومانین کە نامان‌گەیەنێتە ئاکام و بۆ چوونێکی ڕاست و نزیك لە ڕیالیستی مەسەلەکەوە ، جا ئەوەی تەواو پەیوەندی‌یەتی بنەڕەتی و توندی بەم گیروگرفتانەوە هەبێ و هەمیشە بەهۆیەکی کاریگەر سەرەکی دابنرێت .. هۆی « چەپۆکی ئیمپریالیزمە » لەسەر ئەم وولاتانە وئەوەی شایانی باسە .. میللەتە ژێر دەستەکانی باش بۆیان دەرکەوت ، کە ئەم گیروگرفتە ناهەموارەی دواکەوتن هەمیشە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپریالیزم داگیرکەرەکان ، هەر ئیمپریالیزمە دەبێتە هۆی دواکەوتن ، لەو کاتەی کەدواکەوتنیشی لە لایەکی ترەوە ، هانی ئیمپریالیزم دەدات بۆ چەپۆك هاوێشتن و ، دەست بەسەراگرتن و داگیر کردن ..

زوربەی ئەم وولاتانە ، ژێر دەستەی وولاتە پێش کەوتووە پیشە سازە ئیمپریالیزمەکان بوون ، بۆ ماوەیەکی زۆر ، تاڵی و ناهەمواریەکی بێ شوومایان لە دەست داگیرکەر چێشت ، کە هەردەم ئابووری سامانی ئەم وولاتانەیان دەمژی و بەخۆڕایی کەرەسەو مادده خاوەکانیان دەگواستەوە بۆ کارگەکانیان هەردەم کردبوویانێ بەسەر چارەیەکی سەرەکی بۆ بەدەست هێنانی کەرەسەو بازاڕێکی گەورە ، بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمەکانیان ، جگە لەمەش جۆرەها هۆکاری ئابووری و ڕامیاری وبازرگانی و دارایان بەکاردەهێنا بۆ مەبەستی مسۆگەرکردن و بەردەوام بوونیان لەو تاڵن کردن و چەوساندنەوەیە ، بێ ئەوەی هیچ گرنگی و بایەخێك بدەن بە پێشکەوتنی پیشەسازی خۆماڵی ئەو وولاتانە وپاشەڕۆژی باری ئابوری و ئاستی ژیانی گەلەکانی ، بەڵکو بەرژەوەندی نیشتمانی ئەو وولاتانەیان بەیەك جار خستبووە پشت گوێ ، جگە لە بایەخ دانیان بەهەندێ بوار نەبێ ، کە ئەویش بەڕادەیەکی کەم. ئەوەش سەبارەت بەو پرۆژەکارانەی بەرژەوەندی تەواوی خۆیانی تێدابوو ، وەك ڕاکێشانی هەندێ ڕێگاوبان و هۆکارانی گواستنەوە ، وەیان دروست کردنی هەندێ دەستگا گشتیەکان ئەوەش وەکو ووتمان تەنها بەنیازی خزمەت جێ بەجێ کردنی کاروبارو بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیان ، وئاسان کردنی مەبەستی ناردنی کەرەسەو مادده خاووەکان بۆ دەرەوەی ئەو وولاتانە ، بەمەبەستی مسۆگەر کردنی کەرەسەی پێویست بۆ پیشەسازی‌یەکانیان و گەرمی بازاڕەکانیان ، و بەدەست هێنانی زۆرترین دەست کەوت و قازانج ..

# سروودی شادمانی
# وەک نامیلکەیەک بۆ منداڵان

« سرووودی شادمانی » ناونیشانی ئەو نامیلکه خنجیلانەیە بوو کەلەم دوایەدا کاك عبدوللا کەریم خستیە بەردەست خوێنەرانو منالآنی کورد ، که تیایدا نۆ «٩» چیرۆکی منالآنی له «٣١» لاپەڕەدا به خۆوه گرتبوو. منیش وەکو خوینەرێك له ئەنجامی تاوتوێ کردنو خویندنەوەیەکی چەند جارەکی ئەو نامیلکەیە چەند شتێکم لە لا کۆبوەوە که شایانی لێدوانو باس لێوەکردنیانبوو : بۆیه به پیویستم زانی بیانخەمه بەرچاوی خوێنەرانو بەو نیازەی سرووی خۆی هەبوو بێو شتیکی لەو بارەیەوە ڕوون کردبێتەوە .

**کۆرپەلە لە ڕووەك** زانیدا بەشیکی بچکۆلەیە **لەتۆو یان بابڵین** « تۆویکی ڕووەکی یە » که ئەتوانین لە هەندێ تۆوودا ئەمە ڕەچاو بکەینو بە ئامانی کۆرپەله بەچاو ببینین . کۆرپەلەش بچووك بێ یا گەورە ، **تەنها بنچکێك نی یە کەبنچکێکی کامل بووی لێوە دروست بووبێ** ، ئەویش دوای تێپەڕبوونی بە گشت **مەرجەکانی نەشو نماکردنی ڕووەکیدا** . چیرۆکیش تەنها بنچکیکی کامل بوو نی یه که کۆرپەلەکەی فیکرەو بەتەکەی بێ ، وەك چۆن ناگونجێ هەموو کۆرپەلەیەك بگۆڕدرێ بۆ بنچکێکی کامل بوو ئەگەر به قۆناغەکانی نەشو نماکردنی ڕووەکیدا نەڕوا ، ئەوا چیرۆکیش هەر بەو جۆرە هەموو فیکرەیەك چیرۆکی لێ دروست نکرێ ئەگەر پەیڕەوی گشت مەرجە هونەری یەکانی چیرۆك نووسین نەکا ، هەرچەندە ئەو فیکرەیەی کە هەشمانە زۆر تەواوو مەعقوولیش بێ چونکە وەکو ئەزانین فیکرە لە چیرۆکدا هەموو شتێك نی یە ، بۆیه ئەبێ شان بە شانی فیکرەکە هەموو مەرجەکانی چیرۆك نووسین ڕەچاو بکرێو وە بە شیوەیەکی ئەوتۆش بابەتەکە دابڕێژدرێ هەر لەگەڵ خوێندنەوەیدا هەستو هۆشی خوێنەر یا منداڵ بۆ لای خۆی ڕابکێشێو واش لەخوێنەر بکا کە خوێندنەوەکەی دووبارەو سێ بارە بکاتەوە . وە ئەبێ لەوەش ئاگادار بین کە کاری چیرۆك نووسین بۆ منداڵ کاریکی هێندە ئاسان نی یە ، هەرکەسە لە لایەن خۆیەوە دەستی قەڵەمی گرت ئیتر نیتی چیرۆکی لێبێنێو چیرۆك وای چیرۆك لەسەر یەکتریان کەڵەکە بکاو دوایش هەر تاقەتیچوو لە نامیلکەیەکدا کۆیان بکاتەوەو لە چاپیان بدا . هونەری چیرۆك نووسینیش وەکو هەموو هونەرە جیهانی یەکانی تر هەلو مەرجی تایبەتی خۆی هەیە ، شارەزایی ئەوێ ، کەسانیکی ئەو تۆی ئەوێ کە هەر هیچ نەبێ دوو سێ کتێبی لەو بارەیەوە خوێندبێتەوە . کەسانێك کە توانای داهێنانی هەبێو ئەو بابەتانە هەڵبژێرێ کە تا ئێستا نەووترابێو لەگەڵ هەستو نەستی منالدا بگونجێ ، کەسانێك کە بە تەواوی لە جیهانە فراوانەکەی منداڵان گەشتبێ ، وەوەکو ئەڵێت **« گرانی نووسین بۆ منداڵان ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك** ، گرنگترینیان بێ توانایی‌و دەست بە سەرانە شکاندنی نووسەرە بۆ تیگەیشتن لە جیهانی منداڵان »

دەبا ئێستا لەژێر ڕۆشنایی ئەم چەند دێرەدا ئاوڕێك لەو کۆمەڵە چیرۆکە بدەینەوەو بزانین ئەو بابەتانەی چیرۆك نووس هەڵیبژاردوون تا چ ڕادەیەك لەگەڵ قسەکانما یەك ئەگرنەوە . زۆربەی پاڵەوانەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە گیانەوەرانو هەر خۆشیان ڕۆڵی سەرەکی تیادا ئەگێڕن . هێندێ لەو گیانەوەرانە سەر بەدەستەی بەرەی شەڕنو هەمیشە لە زۆرانبازیو مل ملانێ دان لەگەڵ دەستەکەی تر‌داو هەموو هیواو ئامانجێکشیان دەست بەسەرا گرتنی دەستەکەی ترەو چەوساندنەوەیانە بۆ ئەوەی هەموو شتێ لەژێر ڕکیفیو دەستەڵاتی خۆیانا بمێنیتەوە . هێندیکەی تریشیان سەر بە دەستەی بەرەی خێرنو ئامانجیان بن بڕکردنی گشت هێزیکی چەوسێنەرو زۆرداری یە بۆ بنیات نانی دنیایەکی ئاسوودەو خۆش گوزەرانو دوور لەگشت **زۆرانبازیو چەوسانەوەیەك**. وە وەکو دەرکەوتوەو ئەڵێن زۆر لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە سەر چیرۆکی منداڵان کراون گەیشتوون بەو

ئەنجامەی کە ئەو چیرۆکانەی زیاتر هەستو ئەستی ڕائەکێشێ ، بریتیە لە چیرۆکی گیانەوەران ، واتە ئەو چیرۆکانەی کە پالەوانەکانیان گیانەوەرن . وە بەم بۆنەیەوە لە سالی «١٩٦٤ز» دا گەلێ تاقیکردنەوە لەو ڕووەوە کرا بۆ ئەوەی بزانن مندالان هۆگری چ جۆرە چیرۆکێك ئەبن . وە بۆ ئەم مەبەستە سیو سێ «٣٣» مندالیان کۆکردەوە کەتەمەنیان لە نێوان «٧ـ٩» سالاندا بوو کۆڕیکی سێ «٣» ڕۆژیان بۆ سازکردنو

سێ «٣» جۆر چیرۆکی بۆ خوێندنەوە ، دوای خوێندەوەی چیرۆکەکان ، زۆربەی زۆری مندالەکان لەو چیرۆکە تێکەیشتبوون کە پالەوانەکانی گیانەوەر بوون و بە تەواویش هەستو هۆشیانی ڕاکێشا بوو هەتا کار گەشتبووە ئەوەی دارای دووبارە خوێندەوەیان لێ دەکردن . وە نەبێ ئەمە شتیکی غەریب بێ چونکە هەر لە کۆنەوە ئەو پەیوەندی خۆشەویستی‌یە لە نێوان مرۆڤو گیانەوەرانو پەلەوەراندا هەبووە ، مندالان هەمیشە گیانەوەرانو پەلەوەرانیان خۆش ویستووە «گورگی» واتەنی [ هەتا مریشکیش مندالی خۆش ئەوێ ، بەلام ئایا مندال ئەزانێ چۆن هەلس‌وکەوتی لەگەلا بکاو پەوەردەی بکا ]. وەکو ووتمان زۆربەی ئەم چیرۆکانە گیانەوەران ڕۆلی سەرەکی تیادا دەگێڕن،وە ئەنجامی هەمووشیان ڕووخاندنو تێك شکاندنی دەستەی بەرەی شەڕە ، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا حەقیقەتیکی مێژوویی‌یەو هەر ئەشبێ وابێ ، بۆیە من لە لایەن خۆمەوە ئەمە بە لایەنیکی سەرکەوتووی ئەو چیرۆکانە دائەنێم . بەلام ئاخۆ وەك چۆن لەو بارەیەوە سەرکەوتنی بە دەست هێناوە ئاخۆ لە بارەکانی تریشەوە سەرکەوتن وەدەست دینێت ، لە وەلامدا ئەلێین « نەخێر » چونکە وەکو ووتمان چیرۆك هەر فیکرەیەکی ڕوتو قووت نی‌یەو ببڕیتەوە ، بەلکو مەرجی تایبەتی خۆیی هەیە. ئەمە جۆرێتی داڕشتنی بابەتەکەیە ، ئەمە شێوازە ئەمە تەکنیکە ئەمە حیوارە ئەمە جۆری مامەلە کردنە لەگەل پالەوانەکانا . وەکو ئەلێین ئەو چیرۆکانە بە سەرکەوتوو لەقەلەم ئەدرێن کە کورتو ڕستە کورتو گفتوگۆکردنی تیادابێ لە نیوان پالەوانەکانا ، چونکە « حوار » یەکێکە لە هەرە گرنگترین وەسیلە کە چیرۆك نووسی پشتی پێ ئەبەستێ بۆ وێنەگرتنی پالەوانەکانو سەرچاوەیەکی سەرەکی‌چیرۆکیشە کە بەهۆیەوە پالەوانەکان یەکانگیری یەکدی ئەبنەوە ، وەئەشبێ «حوار» ەکان لەگەل ناوەرۆکی چیرۆکەکەدا بگونجێ و شان بەشانی سروشتی چیرۆکەکە بڕواو لەگەل هەلویستو ڕووداوەکانا بگونجێن نەك بە پێی سروشتی چیروك نووسەکە خۆی ، واتا بە ئارەزووی چیرۆك نووس ، وەکو لەم کۆمەلە چیرۆکەدا دەرئەکەوێ ، ئەمن نازانم ئەبێ پەیوەندی « هەنگ » بە « کۆترو کەوو گورگە » وە چی بێ ، یان بۆچی « هەنگو کەو » لە گورگ بترسن . یان تۆ بلێی « هەنگو کوترو کەو » لەیەك دەوروبەردا کۆببنەوەو دەستگرۆیی یەکتر بکەن ، ئەگەر ئەشلێ ڕەمزە ، خۆ ئەبێ بزانن چۆن ڕەمز بەکارئەهێنینو تەعامولیان لەگەل ئەکەین ، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو هەلە زمانەوانیەی کە چیرۆك نووسی تێی کەوتووە . وە هەروەها عەبدوللا لە هەردوو چیرۆکی « نازەو شاخەوان » و «خۆشەویستی نیشتمان» دا بەحساب وێنەی ئەو پەیوەندی‌یەی بۆ کێشاوین کە لە نیوان مرۆڤ خاکو نیشتماندا هەیە ، ئەو پەیوەندی‌یەی کەهۆن هۆن خوێنی سۆزو خۆشەویستی لێ ئەتکێ ، ئەو خۆشەویستی‌یەی کە لەسەرووی خۆشەویستی گشت شتیکی دی کەوەیەو مرۆڤ سەرو مالو گیانی بۆ دەکاتە کۆچی قوربانی ، بەلام ئاخۆ عەبدوللا توانیویەتی ئەم وێنەیەمان لە چوارچێوەی چیرۆکیکی هونەریدا بۆ بگرێ ، یان هەر بە دەستووری ئەوانی تر وێنەیەکی دەستکردی ڕیپۆرتاژیانەی بۆ گرتووینو هیچی تر با ئەوەش بلێین کە لە چیرۆکی « خۆشەویستی نیشتمان » دا تۆزێك لەو شێوە بەکارهێنانە لای داوە . جوانترین چیرۆکی ئەم نامیکەیە بە ڕای من چیرۆکی « هاوڕێی دلسۆز » ە

چ لەڕووی هونەری‌یەوە وە چ لە ڕووی هەلبژاردنی بابەتەکەشەوە . ئەوەتا هەر کە « بایز » باوکی ئەمرێو تەرکی قوتابخانە ئەکاو دەست دەکا بە حەمالی کردنو هاوڕکانی بە کولو بارەوە ئەیبینن. هەندیکیان پێی پێ ئەکەنو هەندیکی تریشیان دەستگرۆیی ئەکەن بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئیش کردن . کە ئەم جۆرە وێنە گرتنە خۆی لەخۆیدا کاریکی شیاوەو پیویستیە بخرێتە گشت کارێکی ئەدەبیەوە ، وە لەم چیرۆکەدا بە تەواوی جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکەی بۆ دەرخستووینو ئەوەشمان پیشان‌ئەدا کە خێزانە بۆرژوازی‌یەکان هەر کە منالەکانیان پیرۆکەبوون فێری هەموو دابو ڕەشتە بۆ گەنەکانی خۆیانیان

کردوون . ئەو چەند چیرۆکەی دوایش نەدەبوو بەو شێوە ساکارە بخرێتە بەر دەم منالآن ، چونکە قووت کردنەوەی ووشەو کۆمەڵێ زاراوە هیچ شتیکی ئەوتۆ لەمندال ناگەیەنێ ، ئەمە بێجگە لەوەی هەمووشیان شیوەیەکی سادەو ڕیپورتاژیانەیـان وەرگرتـووەو دوورن لە هەڵو مەرجی هونەریی چیرۆکەوە ، بۆیـە بە پیویستم نەزانی هیچیان لە بارەوە بدوێـم . دوا ووتەم دەربارەی وێنەکانی ناو ئـەم نامیلکەیەیـە کەبەڕای من نەبوونیان لە بوونیان باشتر بوو . چونکە خۆ وێنە بۆ جوانیو ڕازاندنەوەی نامیلکەکە بـۆ چیرۆکەکان ناکرێت . ئەمە جگە لەوەی وێنەکـان هەموویان بێگیانن « جامد » ن . وێنە ڕۆلیکی کاریگەر ئەگرێ لە چیرۆکی منداڵانا چونکە بە هۆیەوە چەند زانیارییەك دەربارەی چیرۆکەکان بۆ منـداڵان ڕوون دەکاتەوەو هێندەش بە خوێندنەوەی چیرۆکـەکانەوە ماندوویان ناکات ، وەناشبێ تەنها چیرۆکەکە وەکـو مادەیەکی چاپکراو پێش کەش بکرێ ، بەڵکو ئـەبێ شان‌بەشانی مادە چاپکراوەکـە وێنـەی جـوانو ڕەنگاوڕەنگو جوڵاوی تیا بێ کـە شتێك دەربارەی چیرۆکەکە بۆ منداڵ ڕوون بکاتەوە . چونکە زمانـی نووسین منداڵ هیلاك ئەکلو وای لێدەکا هەر زوو لە خوێندنەوەی وەڕس‌ببـن . لە کۆتاییـدا هیوام سەرکەوتنی نووسەرە لە بەرهەمەکانی ئایندەیدا .

**سەرچاوەکان :**

(١) سروودی شادمانی عەبدوڵلا کەریم

(٢) ادب الاطفال ـ فلسفته فنونه ، وسائطه ـ هادی نعمان الهیتی



## وشه‌یه‌ك

### نه‌وروٚز ..

له مێژووی هه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌کی ئه‌م سه‌رزه‌مینه‌دا هه‌ندێ ڕوٚژ وه‌ك ئه‌ستێره له‌ئاسمانی شینی‌دا هه‌میشه ئه‌دره‌وشێته‌وه ، لوتکه‌ی پیروٚزی‌و به‌رزی ئه‌گاته قووله‌ی قاف .. به‌چه‌شنێ ڕه‌گ‌و ڕیشه‌ی مه‌زنی‌و گرنگی داکوتاوه له دڵ‌و ده‌روونی گه‌ل‌دا . له‌م ڕوٚژه تایبه‌تی‌یانه‌دا کوٚمه‌ڵانی خه‌ڵك به‌وپه‌ڕی به‌ختیاری‌یه‌وه ئاهه‌نگ‌و شایی تیا ئه‌کێڕن ، به‌سه‌ره‌تایه‌کی نوێ‌و به‌دووریانێکی گه‌وره‌ی له‌ڕێڕه‌وی کاروانی خه‌بات‌و پێشکه‌وتنیاندا دائه‌نێن به‌م پێیه ئه‌م ڕوٚژانه به نیشانه‌ی قه‌وماوێکی مه‌زن ڕوٚژهه‌ڵهاتنێکی نوێ‌و ده‌ورێکی‌تازه . پێچانه‌وه‌ی ده‌ورو دوکانێکی کوٚن هه‌ره‌س هێنانی ڕوٚژێکی‌دوا بڕاو له‌قه‌ڵه‌م ئه‌درێ .

جه‌ژنی نه‌وروٚزیش لای گه‌لی کورد ڕوٚژێکی نه‌ته‌وه‌یی پیروٚزی ئاوه‌هایه که‌نیشانه‌ی سه‌رکه‌وتنی هێزی گه‌ل‌و ژێرکه‌وتنی زوٚردارو سته‌مکاره ، نیشانه‌ی زاڵ بوونی کاوه‌ی هه‌ژاری کورده به‌سه‌ر ئه‌ژده‌هاکی خوێن مژو ده‌سته‌ڵات دارا .. له‌م ڕوٚژه‌دا گه‌لی کورد له سه‌ر تاپای کوردستان‌دا .. زوٚر به‌دڵێکی پڕئاوات ئاهه‌نگ‌و شایی خه‌باتی بێ‌ووچان ئه‌گێڕێ .. گوڕ ببه‌ستێته‌وه دواکه‌وتنی‌بدا به‌زوی‌دا به‌ره‌و پیشکه‌وتن و یه‌کتیی‌و برایه‌تی هه‌ڵگاوێنی .

له هه‌موو جه‌ژنه میللی‌یه‌کاندا به‌تایبه‌تی له جه‌ژنی نه‌وروزدا بوٚ گه‌ل هه‌یه به‌سه‌ر تاپا کارو فه‌رمان‌و خه‌باتی پڕ تاقی کردنه‌وه‌ی تاڵ‌و تفتی ڕابوردو یا بچێته‌وه ، به چاوێکی تیژو به بیرێکی نوێ والآبێژی گونجاو له گه‌ڵ چه‌رخی ئه‌مڕوٚدا به ده‌روونێکی فراوانه‌وه .. با توٚزێ دوور ئاوڕێك له‌کوٚنی پڕمه‌ینه‌تی جه‌رگ بڕ بداته‌وه .. له ته‌رازووی به‌رژه‌وه‌ندی به‌رزه‌وه به‌زانایی ئه‌وتاقی کردنه‌وانه هه‌ڵسه‌نگێنێ‌و بکێشێ ، ڕوٚژانی نه‌وروزی جاران به‌راوردکا له گه‌ڵ ڕوٚژانی ئێستادا ، ڕوو بکاته ئاسوٚی فراوانی پێشکه‌و تن‌و یه‌کێتی‌و برایه‌تی .

ئه‌مڕوٚ که سه‌رتاپای وڵات سه‌وز ئه‌چێته‌وه دارو دره‌خت تێکڕا بوژاونه‌وه په‌له‌وه‌ڕو گیان له‌به‌ر گشتی به‌ده‌م جوانی دیمه‌نی کوردستانه‌وه پێ‌ئه‌که‌نن ، کانیاو و کارێزه‌کان هه‌موو ئه‌ته‌قسێنه‌وه ، کوٚمه‌ڵانی خه‌ڵکیش به‌رگی سه‌رماو سوٚڵه‌ی زستانیان دادری به‌دل فراوانی‌و به‌ختیاری‌یه‌وه ئاگری نه‌وروٚز ئه‌که‌نه‌وه . بانگی دونیایه‌کی نوێی تازه ئه‌ده‌ن .. نه‌وروٚزی ئه‌م‌ساڵ به‌دروشمی یه‌کێتی‌و برایه‌تی نێوان کوردو عه‌ره‌ب‌و که‌مایه‌تیه‌کان .. ده‌مه‌زه‌رد ده که‌نه‌وه ، به کوێرایی چاوی دوژمن لاپه‌ڕه‌یه‌کی نوێ تر له ژیان له پێشکه‌وتن وسه‌رکه‌وتن هه‌ڵده‌ده‌نه‌وه ، وه‌ئه‌م به‌هاره بکه‌ن به به‌هاری نه‌وروٚز .. ده‌ستکه‌وت .. رایه‌تی .. یه‌کێتی .

غفور

### بانگه‌وازێك له گوٚڤاری ( ڕوٚشنبیری نوێ ) وه

ده‌زگاکه‌مان .. ده‌زگای ڕوٚشنبیری‌و بڵاوکردنه‌وه‌ی کوردی هاته‌سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه‌ی که وه‌ك بایه‌خ به باری ئه‌ده‌بی کوردی ده‌دات ئاوهاش بایه‌خ به‌باری ڕوٚشنبیري بدات ، بوٚ ئه‌مه گوٚڤاری ڕوٚشنبیری نوێی ته‌رخان کرد بوٚ بڵاوکردنه‌وه‌ی باس‌و بابه‌ته‌کانی تری ژیان که‌په‌یوه‌ندی به توێژینه‌وه‌و لێکوٚڵینه‌وه‌ی جوٚراو جوٚری بابه‌ته کوٚمه‌ڵایه‌تی‌و زانستی‌و هونه‌ری‌یه‌کانه‌وه هه‌یه‌و به هوٚیه‌وه نوێترین داهینان‌و دوٚزینه‌وه‌ی زانستیانه‌و باس‌و خواسه‌کانی ته‌کنولوژیاو لێکوٚڵینه‌وه‌ی مێژوویی نه‌ته‌وه‌و میلله‌تان‌و باسه زمانناسیه‌کان‌و قوتابخانه جوٚراو جوٚره‌کانی هونه‌رو ڕه‌خنه‌و لێکوٚڵینه‌وه‌ی‌هونه‌ره جوٚراو جوٚره‌کان‌و بابه‌ته فه‌لسه‌فیه‌کان‌و شێکردنه‌وه‌ی باری کوٚمه‌ڵایه‌تی‌و ئابووری و په‌روه‌رده‌یی‌و دیارده سروشتیه‌کان له هه‌موو جیهان‌و گه‌دوون‌داو به ده‌یان بابه‌تی تری ڕوٚشنبیری گشتی پێشکه‌ش به خوێنه‌رانی بکات ،

چونکه ده‌سته‌ی نووسه‌رانی ئه‌م گوڤاره هاتته سه‌ر ئه‌و بڕوایه‌ی که ئێمه‌ی کوردیش وه‌ك گه‌لانی پێشکه‌وتووی جیهان پێویستی‌مان به‌وه هه‌یه که له کاروانی پێشکه‌وتن‌و زانست‌و شارستانێتی‌دا ده‌ورێکی دیارو له سنووری قه‌واره‌ی خوێ‌دا هه‌بێ‌و هه‌ر هیچ نه‌بێ با گوڤارێکی واشی هه‌بێ که بوٚ ئه‌م بابه‌تانه ته‌رخان بێ ، ئه‌م ئاواته‌ش گه‌ر هه‌وڵ‌و کوٚشش‌و ده‌ستی یارمه‌تی زاناو پسپوٚڕانی کورد نه‌بێ نایه‌ته دی .. بوٚیه به‌م بانگه‌وازه ڕوو له گشت ڕوشنبیران‌و شاره‌زایانی نه‌ته‌وه‌که‌مان ده‌که‌ین که چ به به‌رهه‌می خوٚیان .. یا هی وه‌رگیراو له زمانانی ترموه هاوکاریمان له گه‌ڵ‌دا بکه‌ن .. جا ئێتر گه‌ر به زمانی کوردی بوٚمانی بنێرن ئه‌وه چاکه‌و ئه‌گه‌ر به زمانی عه‌ره‌بیش بێ ئه‌وه به سوپاسه‌وه خوٚمان لێره ده‌یگوڕینه سه‌ر کوردی‌و بڵاوی ده‌که‌ینه‌وه .

ئیتر ئێوه‌و گوڤاره نوێ‌که‌تان‌و هیممه‌تتان ..


رئيس التحرير اسماعيل رسول نائب رئيس التحرير فائق جميل

نرخی ٥٠ فلسه ئه‌م ژماره‌یه ١٤٠٠٠ دانه‌ی‌لێ چاپکراوه طبع بمطبعة الزمان - بغداد

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

ROSHINBIRY NWE
General Monthly Magazine
Issued by : The Kurdish House For Culture and Publishing
Ministry of Culture and Information
Baghdad — Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

